
تەنها بەدیاری دەبەخشرێ
زنجیرە ( ٨٨ )
پەیامەکانی بەرەو بەهەشت
منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
سیرە
ئاداب
بیروباوەڕ
فقهی شەریعەت
فەرموودە
زیکرەکان
ئامادەکرنی
باوکی چیای خولەکان
١٤٣٨ك
٢٠١٦ز

# پەیامەکانی بەرەو بەهەشت

**(٨٨)**

ئامادەکردنی

باوکی چیای خولەکان

چاپی یەکەم

هەولێر

١٤٣٨ك ٢٠١٦ز

## ناسنامەی کتێب

**ناوی کتێب: پەیامەکانی بەرەو بەهەشت**

**زنجیرە : ( ٨٨ )**

**بابەت: ئایینی**

**ئامادەکردنی: باوکی چیای خولەکان**

**پیت چنین: لانە هۆگر**

**چاپ: چاپی یەکەم / هەولێر**

**تیراژ: ( ١٠٠٠ ) دانە**

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی ( ٦٣٠ )ی
سالّی (٢٠١٦)ی دراوەتێ

## بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على خاتم الانبياء والمرسلين محمد وآله وصحبه أجمعين.

ماوەیەك بوو لەهەوڵی ئەوە دابووم هەندێك زانستی شەرعی بەشێوەیەکی سەرەتایی و پوخت بخەمە بەر دەستی مامۆستاو قوتابیان تاکو بتوانن بەئاسانی بیخوێنن و بەسانایی لەپەیامەکەی بگەن، ئیتر سوپاس بۆ خوا بەهاوکاری ئەو توانیمان چەند دێڕێکی ئاسان و مانابەخش هەڵنجین لەزانستەکانی (**بیروباوەڕ، ئاداب، سیرە، زیکرەکان، فەرموودە، فقهی شەریعەت**).

بەچەند بەرگێك لەزنجیرەکانی بەرەو بەهەشت، ئێستاش دووبارە سوپاس بۆ خودا تێکرایمان کۆکردەوە لەیەك بەرگدا کەبۆ خوێندن و دەست کەوتن ئاسانتربێ.

جا ئەی ئەو بەرێزەی خۆت بەبەپێشەواو وتاربێژی ئەم ئومەتە هەڵبژاردووە (خودا پایە دارترت کا) ئەم زانستە شەرعیە سەرەتاییە فێری فەقێ کانت بکە.

ئەی مامۆستای بەرێزی ماندوونەناس قوتابیەکانت پەروەردە بکە بەم زانستانە پێش فێرکردن چونکە پەروەردە پێش فێرکردنە هەروەها تۆی باوك وتۆی دایك ئەی خودا گەورە نەی فەرمووە؟ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا﴾ التحريم: ٦

**واتە:** ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە خۆتان و کەسوکارتان بپارێزن لەئاگر

چۆن منداڵەکانت لەئاگر دەپارێزی ئەگەر ئێواران بەدیاریانەوە دانەنیشیت و بەم زانستە سەرەتاییە تێراو یان نەکەی؟!!

خۆ ئەگەر ماندوو سەرقاڵی و کاتیشت نییە، ئەوا کەسێکی ئیمانداریان بۆ بدۆزەوەو تافێریان بکات و پەروەردەیان بکات بەڵکو لەقیامەت سەربەرزو رووسپی بەرانبەر تەرازووی خودای باڵادەست و مهرەبان بی.

**هۆگر قاسم**
**باوکی چیای خولەکان**
**هەولێر**

# پایەکانی ئیمان

## پایەی یەکەم:

باوەڕبوون بە خوای گەورە (الایمان بالله)

## پایەی دووەم:

باوەڕبوون بە فریشتەکان ( الایمان بالملائکة)

## پایەی سێیەم:

باوەڕ بوون بە کتێبە ئاسمانیەکان (الایمان بالکتب)

## پایەی چوارەم:

باوەڕبوون بە پێغەمبەران(الایمان بالرسل)

## پایەی پێنجەم:

باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی (الایمان بالیوم الاخر)

## پایەی شەشەم:

باوەڕبوون بە قەزاو قەدەر (الایمان باالقضاء والقدر)

## بنچینەی بیروباوەڕ

دامەزراوە لەسەر ئەم شەش پایە باوەڕ (بە خودا، مەلائیکەت، کتێبە ئاسمانیەکان، پێغەمبەران، ڕۆژی قیامەت، قەزاو قەدەر خێرو شەڕی).

قال تعالى: ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ والنبيين ﴾ البقرة: ١٧٧.

**واتە:** کرداری چاك و کاری باش تەنها بریتیی نییە لەڕووکردنتان بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا (چونکە جولەکە زۆر لەسەر گۆڕانی قیبلە دوانو پڕو پاگەندەی زۆریان کرد)،بەڵکو کرداری چاك وکاری باش بریتییە لەوەی کەئادەمیزاد باوەڕی هێنابێت بە خوداو ڕۆژی دوایی‌و فریشتەکانو کتێبەکانو پێغەمبەران.

قال تعالى: ﴿ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴾ القمر: ٤٩

**واتە:** بێ گومان ئێمە هەمووشتێکمان بەئەندازەو نەخشەی دیاری کراو دروست کردوە.

# پایەی یەکەم:
# باوەڕبوون بە خوای گەورە (الایمان باللّه)

ناسینی خوا بە جوانیو بەتەواوی وەك چۆن خۆیو پێغەمبەرەکەی باسیان کردووە، وەسفیان کردووە، لەهەموو پەرستنێکدا یەکخواناس بی دووربی لەهەموو هاوبەش بڕیاردانێك.

دەبێت بزانین خوای گەورە نە نێرەو نە مێیە ونە دەخوات و نەدەخەویّ، نە پێویستی بە یارمەتی دانە بۆ هەڵسوڕاندنی کارەکانی و هاوشێوەو هاوەڵی نیە، دەسەڵاتداری تەواوە بەسەر هەموو شتێکدا .

**بەرهەمەکانی باوەڕبوون بە خوا:**

١- هاتنە دی یەکخواناسی خوای گەورە بەشێوەیەك کە جگە لە ئەو نەپەرستریّ .

٢- خۆشەویستی تەواو بۆ خواو بەرزراگرتنی بە پێی ناوە جوانەکانیو سیفەتە بەرزەکانی.

٣- هاتنە دی بەندایەتی بۆ خوا بە ئەنجام دانی فرمانەکانی ودوور کەوتنەوە لەقەدەغەکراوەکانی.

٤- بەدەستهێنانی بەرگری خودایی (دفاع) لەبەرامبەر پیلان وفێڵەکانی دوژمنەکانمان.

٥- بەدەست هێنانی ژیانێکی پاكو بەختەوەرو ئاسودە .

٦- پاك بوونەوەی دەروون لەخورافات و بەدەست هێنانی رەزامەندی خوا و چوونە بەهەشت.

## پایەی دووەم:
## باوەڕبوون بە فریشتەکان (الایمان بالملائکة):

دەبێت باوەڕمان وا بێت فریشتەکان دروست کراون لەرووناکی (النور)، نە نێرو نە مێنە. تەنها خواپەرستی خوای گەورە دەکەن بەجێبەجێ کردنی فەرمانەکانی هەر گیز سەرپێچی ناکەن.

**ناوی هەندێك لەفریشتەکان و کارەکانیان:**

١- **جبرائیل**: فریشتەی نیگا (الوحی) (علیه السلام).

٢- **إسرافیل**: فووکردن لە(بوق) (النفخ فی الصور) (علیه السلام).

٣-**میکائیل**: باران بارین(علیه السلام).

٤-**مالك**: وەکیلی جەهەننەم(علیه السلام).

٥-**ملك الموت**: گیان کێشان (علیه السلام).

هەندێکیشیان کاری هەڵگرتنی عەرشیان پێدراوە، هەندێکیش گیان لەبەرکردنی ئادەمیزاد، هەندێکیش چاودێری ئادەمیزاد، هەشیانە کردەوەی ئادەمیزاد دەنوسنەوە، هەشیانە پرسیارەکانی ناو گۆڕ دەکات، هەشیانە کاری تەسبیحاتو کڕنوش دەبات، هەشیانە بۆ پاراستنی کێو، چەندین مەلائیکەی تریش بۆ کاری جیاواز تر دروست کراون.



**شێوەیان:**

گەورەو بەهێزن، زۆر جوانن، پلەو پایەی جیا جیایان هەیە ژمارەی باڵەکانیان جیایە.

**توانایان:**

دەتوانن خۆیان بگۆڕن، زۆر خێران، زانیاریان زۆرە، کاروبارەکانیان تەواو ڕێکە.

## بەروبومەکانی باوەڕبوون بە فریشتەکان:

١- زانینی گەورەیی‌و بەهێزی دەسەڵاتی خودای گەورە.

٢- سوپاس کردنی خودای گەورە لەسەر بایەخ دان‌و چاودێری کردنی بۆ ئادەمیزادو دروست کراوەکانی تریش.

٣- خۆش ویستنی فریشتەکان لەسەر بەندایەتی کردنیان بۆ خودای گەورە.

٤- بەردەوام بوون لەسەر خواپەرستی چونکە فریشتەکان کردەوەکانت دەنووسن.

# پایەی سێیەم:

## باوەڕبوون بە کتێبە ئاسمانیەکان (الایمان بالکتب)

ئەوەیە کەوا بیروباوەڕێکی تەواوت هەبێت کە خوای گەورە کتێبی بۆ پێغەمبەران دابەزاندووە بۆ ئەوەی ببنە مایەی ڕێنمایی‌و ڕۆشنایی بۆ خەڵکی‌و کامەرانی دونیاو قیامەت بەدەست بێنن.

**ناوی هەندێك لەکتێبە ئاسمانیەکان:**

١- **الصحف**: بۆ إبراهیم علیه السلام.

٢- **التوراة**: بۆ پێغەمبەر موسی علیه السلام.

٣- **الانجیل**: بۆ پێغەمبەر عیسی علیه السلام.

٤- **الزبور**: بۆ پێغەمبەر داود علیه السلام.

٥- **القرآن**: بۆ پێغەمبەر محمد صلی الله علیه وسلم.

باوەڕبوون بەوەی کە ئەمانە لەلایەن خوداوە دابەزیون، ووتەی خوای گەورەن، ئەو هەواڵانەی کە تیایاندا هاتووە و باوەڕبون بە ناوەکانیان و ئەوانەی کە ناویشیان لەقورئان نەهاتووە.

لەگەڵ کار پێ کردن بە (قورئان) بەوەی کە دوایین کتێبی ئاسمانیە خودا پەیمانی پاراستنی داوەو کتێبەکانی پێش خۆی (نسخ) کردیتەوە.

## بەرهەمەکانی باوەڕبون بە کتێبە ئاسمانیەکان:

١- زانینی کە خوای گەورە بایەخی بە بەندەکانی داوە کە کتێبی بۆ دابەزاندون.

٢- زانینی دانایی خوای گەورە لەناردنی هەر کتێبێك کە لەگەڵ حالی نەتەوەکەی بگونجێ.

٣- سوپاس کردنی خوای گەورە لەسەر ئەو هەموو هیدایەتو نازو نیعمەتو چاکانەی لەکتێبەکاندا هاتوون.

# پایەی چوارەم:

## باوەڕبوون بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام )

### (الایمان بالرسل)

باوەربوون بەوەی خودای گەورە بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك پێغەمبەرێکی رەوان کردووە لەخۆیان کە بانگیان بکەن بۆ بەندایەتی کردنی خودای گەورە و مژدەدەریشن بۆ ئەوانەی کە گوێڕایەڵیان دەبن ، ترسێنەریشن بۆ ئەوانەی کە وەڵامی بانگەوازەکەیان نادەنەوە، خوا موعجیزەی پێداون بۆ زێتر بەهێزکردنی بانگەوازەکەیان.

پێغەمبەران زۆرن بەڵام ناوی (٢٥)یان لەقورئاندا هاتووە ، لەوان (٥)یان پێیان دەوترێت (أولو العزم) کە ئەوانیش (نوح، إبراهیم، موسی، عیسی، محمد) علیهم الصلاة والسلام چونکە ئەمانە زیاتر دوچاری ئەزیەتو ئازار زۆر بونەتەوە.

پێغەمبەران وەکو مرۆڤەکانی تر ئاسایین توشی نەخۆشیو مردنو ئازار دەبن، پێویستیان بە خواردنو خواردنەوەو نوستن هەبووە وەکو مرۆڤەکانی تر بەڵام پارێزراون(معصوم)ن لەتاوانو گوناه.

بەباوەڕهێنان بە پەیامەکانیان کە راستەو حەقە لەلایەن خواوەیە وبەجوانترین شێوە گەیاندویانە، هەر کەسێك بە ئاینی هەر پێغەمبەرێك باوەڕی نەبێ ئەوە بە ئاینی هەموو پێغەمبەرەکان کافر بووە.

### بەروبومی باوەربوون بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام ):

١- زانینی بەزەیی خوای گەورە کە پێغەمبەرانی بۆمان ناردووە.

٢- خۆشەویستی پێغەمبەران وڕێز لێ گرتنیان و بەنرخ هەڵسەنگاندنی ماندوبونیان.

# پایەی پێنجەم:

## باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی (الایمان باليوم الاخر)

دوایین ڕۆژە کە تێیدا خەڵك بۆ لێپرسینەوەو پاداشتو سزا زیندوو دەکرێنەوەو کاتی هاتنی ئەم ڕۆژە نادیارە تەنها خودا دەیزانێت.

**أ-** باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی ئەوەش لەخۆدەگرێت کە باوەڕت بە نیشانەکانی (بچووكو گەورە)ی پێش ڕۆژی دوایی هەبێت و باوەڕبون بە مردنو دوای مردنیش لەپرسیاری ناو گۆڕو خۆشی و ناخۆشی ناو گۆڕ، ڕۆژی دوایی هەڵناستێت تاکو ئەم نیشانە گەورانە روونەدات (هاتنی مەهدی، هاتنی دجال، دابەزینی عیسی، یأجوج ومأجوج،هەڵکردنی دوو کەڵێکی گەورە(دخان)، هەڵاتنی ڕۆژ لەڕۆژئاوا، هاتنی (الدابه)، تێکدانی کەعبە و کاوڵ بوونی مەدینە، ڕوودانی سێ ڕووچوون (خسف)، هەڵگیرسانی ئاگرێك کە خەڵکی ڕاپێچ دەکات و کۆیان دەکاتەوە).

**ب-** باوەڕ بوون بە مردن و گیان کێشان.

گیان کێشانی ئیمانداران ئاسانە، بەڵام بۆ بێ باوەڕان و تاوان باران بە ئازارو سەختە پاشان تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ بە سێ پرسیار دەست پێدەکات (کێ خوداتە؟ کێ پێغەمبەرتە؟ دینت چیە؟)

پاش وەڵام دانەوەی گۆڕ دەبێتە باخێك لەباخەکانی بەهەشت یان دەبێتە چاڵێك لەچاڵەکانی دۆزەخ، خودا پەنامان بدات.

پاش لێدانی نەفخی (صور)ی دووەم خەڵك کۆدەکرێنەوە ﴿ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ المطففين: ٦

**واتە**: ئەو رۆژەی کە هەموو خەڵکی بەپێوە دەوەستن لەبەردەم پەروەردگاری جیهانیان.

ئینجا لێپرسینەوە (الحساب) دەست پێدەکات

﴿ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾ ﴾ الغاشـــية: ٢٥ - ٢٦

**واتـە**: بێگومـان ئەوانـە نەگەڕانـەوەیان هـەر بـۆ لای ئێمەیـە، لـەوەو دواش بەڕاستی حیساب و لێپرسینەوەو دادگاییان لەسەر ئێمەیە.

پاش دانەوەی نامەی کردەوەکان بەڕێ دەکرێن بەرەو بە هەشت یـان بەرەو دۆزەخ

﴿ جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾ ﴾ البينـة: ٨

**واتـە**: پاداشـتیان لای پـەروەردگاریان بەهەشـتی پـڕ لـەباخی چـڕە (کوشكو تەلارەکان تیایدا ون بوون)، چەندەها روباریش بەژێر درەختو کوشـــکەکانیان دادەڕواتو لـــەوێ ژیـــانی هەمیـــشەییو بـــەردەوام بـــۆ هەتاهەتایی دەبەنەسەر، ئەوانە خوا رازیـە لێیـانو ئـەوانیش لـەو رازیـن، بێگومان ئەو رێزو قەدرە بۆ ئـەو کەسـەیە کـە لەپـەروەردگاری ترسـاوەو فرمانەکانی بەجێ هێناوە.

﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾ النساء: ٥٧

**واتە**: لەبەهەشتدا ژیانی هەمیشەیی و بەردەوام دەبەنەسەر.

﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ﴾السجدة: ٢٠

**واتە**: ئەوانەش تاوانبارو یاخی بوون شوێنیان ناوئاگری دۆزەخە.

## بەرهەمەکانی باوەڕبوون بە رۆژی دوایی:

١-باوەڕبوون بە رۆژی دوایی کاریگەری زۆرە لەسەر بەردەوام بوون لەکاری چاکەو ترسان لەخودا.

٢-دڵ دانەوەی باوەڕداران لەوشتانەی کە لەدونیادا لەدەستیان چووە بەتەمای پاداشتو نیعمەتی ئەو رۆژەن.

# پايەى شەشەم:
## باوەڕبوون بە قەزاو قەدەر (الايمان بالقضاء والقدر)

ئەوەيە كە وا بيروباوەڕێكى تەواوت هەبێت كە هەموو چاكەو خراپەيەك بە بڕيارو دياركردنى و دانايى خواى گەورەڕوودەدات.

﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾ القمر: ٤٩

**واتە**: بێگومان ئێمە هەموو شتێكمان بەئەندازەو نەخشەى ديارى كراو دروست كردووە.

**باوەڕبوون بە قەزاو قەدەر ئەم خاڵانە دەگرێتەوە:**

١-زانستى خواى گەورە دەورى هەموو شتێكى داوەو بەوەى كە بووەو دەبىێ و بەوەى كە بەندەكانى ئەنجامى دەدەن پێش دروست كردنيان.

٢-نووسينى هەموو ئەوانەى كە ڕوودەدەن لە (لوح المحفوظ) پێش دروست كردنى ئاسمانەكانو زەوى بە پەنجا هەزار ساڵ.

٣-ئەوەى كە دەبێت بە ويستى خواى گەورەيە ، ئەوەى ويستى لەسەر بێت ڕوودەدات و ئەوەشى كە ويستى لەسەر نەبێت ڕوونادات﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴾ الحج: ١٨ .

**واتە**: بێ گومان ئێمە هەموو شتێكمان بەئەندازەو نەخشەى ديارى كراو دروست كردووە.

٤-باوەڕهێنان بەوەی کە هەرچی لەگەردوندا هەیە بەزاتو سیفەتو جولەیەوە دروست کراوی خوای گەورەیە((والله خلقكم وما تعملون))

**واتە**: بەراستی خوا ئەوەی بیەوێ دەیکات.

باوەڕهێنان بە قەدەر مانای ئەوە نیە بەندە خاوەنی ویستو خواستو کردەوەو هەڵبژاردنو توانای خۆی نیە بەبەڵگەی شەرعو واقیع.

**لەشەرعدا:**

﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ٢٨﴾ التكوير: ٢٨

**واتە**:بۆ ئەوانەتان کە دەیانەوێت ڕێبازی ڕاستو دروست بگرنەبەر.

﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ﴾ الإنسان: ٣٠

**واتە**:دڵنیاش بن ئێوە هیچتان پێ ناکرێت و هیچ کارێکتان پێ ئەنجام نادرێت مەگەر خواو ویستی لەسەر بێت

﴿فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ﴾الكهف: ٢٩

**واتە**: جا ئەوەی دەیەوێت باباوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێت باکافرو بێ باوەڕبێت.

**لەواقیعدا**: بەندە هەندێك کردەوە بە ویستی خۆی دەیکات وەکو ڕۆیشتن و هەستان و دانیشتن، هەندێك کردەوەش هەن بە ویستی خۆی نایکات وەکو لەرزگرتن و تاو لێدانی دڵ.

هەندێك كەس واتێ دەگات لەقەزاو قەدەر كە واز لەخوداپەرستی بهێنێ و كردەوەی خراپ بكات چونكە لەقەدەر لەسەری نوسراوە ئەمەش هەڵەیە چونكە:

١- ئەگەر قەزاو قەدەر هەنجەت بوایە لەسەر كردەوەی خراپ ئەوا خوای گەورە عەزابی خراپەكانی نەدەدا.

٢- ئەگەر قەزاو قەدەر هەنجەتی خراپەكاران بوایە ئەوە بە هاتنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام )هەنجەتیان دەبڕا.

٣- هەروەكو لەحەدیسی صحیح هاتووە هەر كەسێك لەئێوە ئەوە خوای گەورە جێگایەكی لەبەهەشتو جێگایەكیشی لەدۆزەخ داناوە كەواتە بەدەستهێنانی هەریەكێكیان بە دەست خۆیەتی.

٤- ئەوەی قەزاو قەدەر دەكات بە هەنجەت بۆ خراپەكانی خۆ ئەگەر یەكێك زۆری لێ بكات و ماڵەكەی بە تالان ببات پاشان بڵێ ئەوە بە قەزاو قەدەری خودا وامكردووە و هیچ لۆمەی من مەكە، ئایە تۆ ئەو هەنجەتە لەم كەسە قبول دەكەیت ئەی چۆن قەزاو قەدەر دەكرێتە هەنجەت لەسەر خراپەو تاوان بەرامبەر خودا.

٥- ئەگەر یەكێك دوو رێگای هاتە پێش ، رێگایەك دەچووە وڵاتێكی شەڕو ئاژاوەو كوشتنی تێدابێت ورێگایەكی تریش دەچووە وڵاتێكی ئاسایشو ئارامی ژیانێكی خۆشی تێدا بێت ، ئەوە تۆ كام رێگا دەگری؟ .

## بەروبوومی باوەڕ بوون بە قەزاو قەدەر:

١–باوەڕ بوون بە قەزاو قەدەر گەورەترین پاڵنەرە بۆ تاكەكان بۆ كاركردن و هەوڵدان بە چالاكی بۆ ڕەزامەندی خوا لەدونیا.

٢–پشت بەستان بە خواو دەستەبەركردنی هۆكارەكان چونكە بەستراوەتەوە بە قەدەری خوا.

٣–باوەر بوون بەقەدەر دەبێتە هۆی لەناوبردنی زۆرێك لەنەخۆشیەكانی ناو كۆمەڵگاكان وەكو نەخۆشی حەسودی چونكە مرۆڤی ئیماندار حەسودی بە كەسانێك نابات كە نیعمەتی خوایان لەسەرە چونكە خودا رزق و رۆزی ئەوانی داوەو ئەمە بە قەدەری خوایە.

٤–باوەڕبوون بە قەزاو قەدەر ئازایەتی دەخاتە ناو دڵەكان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تەنگانەكان وەكو جیهاد كردن بۆ؟ چونكە لەمردن ناترسێ تەمەنەكان بە دەستی خودان نە پێش دەكەوێت نە دوادەكەوێت.

## سەرچاوە

١–التوحيد الميسر..........................عبدالله بن احمد الحويل

٢–تسهيل العقيده الاسلاميه.....................عبدالله جبرين

٣–التوحيد للناشئه والمبتدئين.................عبدالعزيز آل عبداللطيف

٤–الواجبات المتحتمات..............   ....... الواجبات المتحتمات

٥–الاصول الثلاثة............................ الاصول الثلاثة

٦–اصول الايمان.........................محمد بن صالح العثيمين

٧–پوختەی بیروباوەرو عەقیدە..............طارق حسن الهموندی

٨–چۆن منالآنمان فێری بیروباوەڕی ئیسلامی بکەین.......باوکی ئەسماء

٩–روونکردنەوەی بنچینەکانی باوەر...................و/جاسم عالآیی .

# پایەکانی ئیسلام

هەر پێنج پایەکانی ئیسلام بریتین لە:ـ

١-شەهادە هێنان.

٢-نوێژ.

٣-ڕۆژوو.

٤-زەکات.

٥-حەج.

# پایەی یەکەم:
# أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أنّ محمداً رسولُ الله

## مانای لا إله إلا الله

لا إله/ واتە هیچ پەرستراوێك نیە شایەنی پەرستن بێت بە حەق.

إلا الله/تەنها خوای گەورە (الله) نەبێت.

## مەرجەکانی لا إله إلا الله

**١- بەزمان بیلێت و دانی پێدا نێت (النطق والاقرار):**
هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) داوای لە(أبو طالب)ی مامی کرد کە ئەم وشەیە بڵێ تاکو لەقیامەت دا تکای بۆ بکات.

**٢- زانین (العلم):** زانیاری و زانستت هەبێت لەسەر ئەم وشەیەو ماناکەی.

**٣- دڵنیایی (الیقین):** دڵی دامەزراو بێت لەسەر ئەم وشەیە هیچ گومانی نەبێت.

**٤- راستگۆیی (الصدق):** واتە بەراستی خۆی بۆ شایەتمان یەکلا بکاتەوە.

**٥- رازی بوون (القبول):** وەرگرتن و رەت نەکردنەوەی هەموو دینەکەی خودا.

**٦- نیازپاکی (الاخلاص):** پێویستە نیەتی پاك بێت، کە پێچەوانەی هاوبەش پەیداکردنە (شرك).

٧- ملكەچ بوون (الانقیاد): پابەندبوون بۆ هەموو داواكاریەكانی خودا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

٨- خۆشەویستی (المحبە): ئەوپەڕی خۆشەویستی بۆ خودا بە رادەیەك كە بەراود ناكرێ.

## محمد رسول الله

واتە: شایەتی دەدەم كە (محمد) بەندەو نێردراوی خودایە، وە كۆتا پێغەمبەرەو بەراست زانینی هەموو هەواڵەكانی كە لەلایەن خودا هێناویەتی، وگوێڕایەڵی فرمانەكانی و دووركەوتنەوە لەقەدەغەكراوەكانی ، وخودا پەرستی بەپێی رێبازی ئەو نەك بە هەواو ئارەزوو.

﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ ﴾ المنافقون: ١

**واتە**: خوا خۆی چاك دەزانێ كە تۆ پێغەمبەرو فرستادەی ئەوێت.

# جۆرەكانی یەك خواناسی
# (أنواع التوحيد)

دەكرێتە سێ جۆر:

**جۆری یەكەم: یەكخواناسی پەروەردگارێتی ( الربوبية )**

باوەڕت هەبێ كە خوای پەروەردگار بە تاك و تەنها بەدیهێنەری هەموو دروست كراوەكانە لەنەبوون دا، خۆی رۆزی دەریانە، مردنو ژیانیان بە دەستی ئەوە، هەڵسوڕینەری هەموو كارو فرمانەكانیانە. بە قازانج و زیانەوە .

قال تعالى : ﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ آل عمران: ١٨٩

**واتە**: هەرچی لەئاسمان و زەوی دا هەیە هەر خوا خاوەنیانەو ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە.

**جۆری دووەم: یەك خواناسی لە پەرەستندا ( الالوهية ) واتە:**

بەتەنها ناسینو پەرستنی خوای گەورە لەكردەوەی بەندەكان بەبێ هاوبەش پەیدا كردن وەكو:

(پارانەوە، هانابردن، نەزركردن، قوربانی كردن، تكا كردن،ترسان، پشت بەستن،هیواو ئومێدبوون، گەرانەوە، فریاكەوتن، بەهاوارهاتن، ملكەچی، شوێن كەوتن، داواو ئاوات).

جا هەر كەسێك شتێك لەوانەی باسكرا بۆ غەیری خودا وەكو (پێغەمبەر یان ملائیكەت یان جنۆكەیان پیاوێكی چاك یان قەبرێك یان دارێك یان پەرۆكێك...) بكات ئەوا ئەوكەسە بێ بڕواو كافر (مشرك) دەبێت.

هەر ئەوجۆرە یەکخواناسیە لەکۆندا کافرەکان دانیان پێ دانەدەنا بۆیە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم) لەگەڵیان دەجەنگا تاکو تەنها ئەم پەرستنانە بۆ خودا بێت:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات: ٥٦

**واتە**: بێ گومان من پەری‌و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوەنەبێت کە من بپەرستن‌و فرمان بەردارم بن.

﴿ وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ﴾النساء: ٣٦

**واتە**: ئەی خەڵکینە تەنها خواپەرستن و هیچ جۆرە شەریك و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن.

## جۆری سێ یەم: یەکخواناسی ناوە جوانەکانی‌و سیفەتە بەرزەکانی

باوەڕبون بە ناوو سیفەتەکانی خودای گەورە کە لەقورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دا هاتوون بەبێ کەم و کورتی وەکو (گۆڕینی واتاو روکەشەکەی – تأویل –، پێکچواندن –تشبیه، نمونە بۆهێنانەوە – تمثیل – ، چۆنیەتی –تکییف–، لەکارخستن –تعطیل–)

. ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾ الشورى: ١١

**واتە**: هیچ شتێك نییە لەوێنەی ئەو زاتە ، هیچ شتێك لەو ناوچێت هەر ئەویش بیسەو بینایە.

# گەورەیی یەکخواناسی ((تەوحید))و پاداشتەکەی:

١-گەورەترین و یەکەمین روکنی ئیمان وئیسلامە.

٢-گوناهەکان دەسڕێتەوە.

٣-گەورەترین هۆیە بۆ رزگاربوون لەدونیاو قیامەت.

٤-خاوەنی - تەوحید- هیدایەتی تەواو و ئارامی تەواو بەدەست دەهێنێت.

٥-تاکە رێگایە بۆ گەیشتن بە رەزامەندی خودا.

٦-رزگارت دەکات لەبەندایەتی کردنی دروست کراوەکان و تەنها بە خودای گەورەت دەبەستێتەوە.

٧-خاوەنی - تەوحید- پارێزراو دەبێت لەچوونە ناو ئاگر.

٨-تاکە رێگایە بۆ چوونە ناو بەهەشت.

## پەرستن ( عیبادەت )

گشتگیرە بۆ هەموو پەرستنێك کە خودا پێی خۆشەو پێی رازیە لەوتەو کردارە ئاشکراو نهێنیەکان.

## مەرجەکانی وەرگرتنی عیبادەت:

١-دەبێت یەکخواناس بێت (الموحّد).

٢-دەبێت تەنها بۆ خودا بێت (الاخلاص).

٣-دەبێت بە پێی شەرع بێت (الصواب).

# جۆرەکانی هاوبەش دانان
# (أنواع الشرك)

**جۆری یەکەم: شیرکی گەورە:** خوای گەورە هەرگیز لەخاوەنی ئەم جۆرە شیرکە خۆش نابێت لەئیسلامیش دەردەچێت هەموو کردەوەکانیشی هەڵدەوەشێتەوە ئەگەر تەوبە نەکات بە هەتا هەتایی لەئاگری دۆزەخ(جهنم) دەمینێتەوە.

وەکو/ پەرستن بۆ غەیری خودا (دوعاو سەربڕینو پشت بەستن...)

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ ﴾ النساء: ٤٨

**واتە:** بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت

﴿لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾ الزمر: ٦٥

**واتە:** ئەگەر هاوەڵگەر بێتو شەریك بۆ خوا بڕیار بدەیت کارو کردەوە چاکەکانیشت پوچە و دەچێتە ڕیزی خەسارەت مەندو زەرەر مەندانەوە.

﴿إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُ ﴾ المائدة: ٧٢

**واتە:** دڵنیابن ئەوەی شەریكو هاوبەشی بۆ خوا بڕیار بدات ئەوا بێگومان خوا بەهەشتی لەسەر حەرام کردووەو شوێنو جێگاو سەرەنجامی ئاگرە.

## جۆرەکانی شیرکی گەورە:

١-شیرکی پاڕانەوە - هاوار کردن - (الدعوة) هەروەکو لەقورئان داهاتووە ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ (العنكبوت : ٦٥).

**واته**: هەر کاتێك خەڵکی (باوەڕ لاوان) سواری کەشتی دەبن، مەترسی نوقم بوونو تیاچوون رویان تێ دەکات، زۆر بەکوڵ هاناو هاوار بۆخودادەبەن و بەدڵسۆزیو ملکەچیەوە باوەڕ دێنن بەلاّم کاتێك خوا رزگاریان دەکات و دەگەنە وشکانی دەست بەجێ لەریبازی یەکتاپەرستی دەترازێنو هاوەڵو هاوبەشی بۆ خوا بڕیاردەدەن.

٢-شیرکی رازو نیازو مەبەست (الارادە والقصد) هەروەکو لەقورئان دا هاتووە ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ إِلَّا النَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا وَبَاطِلٌ مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ (هود ١٥-١٦).

**واته**: هەر کەسێك تەنها ژیانی دونیاو رازاوەیی و خۆش گوزەرانیەکەی بوێت ئەوا پاداشتی هەوڵو کۆششی ئەو جۆرە کەسانە دەدەینەوە لەدونیادا، ئەوانیش تیایدا هیچیان لێ کەم ناکرێتەوە، ئا ئەوانە ئەوانەن کەلەرۆژی دواییدا جگە لە ئاگری دۆزەخ هیچی تریان بۆ نییە و ئەوەی

کە کردیان لەدونیادا پۆچەڵ بۆوەو بێ نرخە، هەروەها ئەو کارو کردەوەی کە دەیانکرد بەتاڵو پوچو بۆشە.

٣-شیرکی گوێ ڕایەڵی (الطاعة) هەروەکو لەقورئان داهاتووە ﴿ اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَٰهًا وَاحِدًا ۖ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ (التوبه: ٣١).

**واتە**: (گاورو جوو) خام وقەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لەجیاتی خوا (مل کەچو فرمانداریانن، ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەلال یان حەرام دەکەن هەروەها مەسیحی کوڕی مریمیش (بەکوری خوا دەزانن) لەکاتێکدا کەفرمانیان پێ نەدراوە جگە لەپەرستنی تاکە خوایەك بێگومان جگە لە و زاتە خوایەکی دیکە نییە، پاکی و بێ گەردیو ستایش بۆ ئەو زاتەیە کە(ئەونەفامانە) هاوەڵی بۆ بڕیاردەدەن.

٤-شیرکی خۆشەویستی (المحبە) هەروەکو لەقورئان دا هاتووە ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُوا إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ ﴾ (البقره:٦٥).

**واتە**: (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا) هەندێك کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی خواپەرست بێ، شتانی دیکە دادەشایێت بۆ خۆیو

(شوێن ڕێنموویییەکانی خوا ناکەوێت) خۆشەویستی وسۆزی دەدات بەوبتو بەرنامۆلکەو تولەڕێگایانەو خۆشی دەوێن، وەك چۆن ئیمانداران خوایان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێت (هەر بەراود ناکرێت) جا ئەوانەی کەستەمیان کردوە گەر دەیانزانی لەکاتێکدا کەبەچاوی خۆیان ڕووبەرووی ئەو سزایە دەبنەوە کەبەراستی بۆیان دەردەکەوێت کەهێزو تواناو دەسەڵات هەر هەموی بەدەست خوایەو دڵنیا دەبوون کە ئەو خوایە سزاکەی زۆر بەئازارە

**جۆری دووەم: شیرکی بچووك:**

**خاوەنەکەی لەئیسلام دەرناچێ بەڵکو کەم و کورتی دەکەوێتە بیروباوەڕەکەی و دوو جۆرە:**

**١-شیرکی بچوکی ئاشکرا وەکو:**

سوێند خواردن بە غەیری خودا، و گوتنی خواو فلان کەس ویستیان لەسەر بێت، خواو فلان نەبوایە وام بەسەر دەهات، چاوزارو متفەرك، شووم و دمۆر(الطیرة)، نووشتەی ناشەرعی، ناونانی عبدالرسول، عبدالحسین، ....).

**٢- شیرکی بچووکی شاراوە، وەکو رووپامایی (الریاء )**

ریاش روودەدات لە(قسە، جلو بەرگ، هاوڕێ، ڕێ کردن،...).

*بۆ خۆپاراستن لەهاوبەش دانان (الشرك) ئەم نزایە بخوێنە:

(اللهمَّ إنِّي أعوذُ بِكَ أن أُشرِكَ بِكَ شَيئاً وأنا أعلَمُ واستغفرُكَ لِما لا أعلَمُ) صحيح الجامع

واتە: خوایە پەنات پیّ ئەگرم لەوەی کە هاوبەشت بۆ دابنێم‌و ئاگادار بم پێی، وە داوای لێخۆشبونت لیّ دەکەم لەوەی کە نایزانم و ئاگادار نیم پێی.

**دووڕوویی و جۆرەکانی ( النفاق وأنواعه )**

**دووڕوویی**: واتە بەدیارخستنی ئیسلام وشاردنەوەی کوفر.

**جۆری یەکەم**: دووڕوویی بە دڵو بیروباوەر (الاعتقادی):

ئەمەش خاوەنەکەی دەچێتە بن بنەوەی جەهەننەم بە تەواوی لەئیسلام دەردەچیّ وەکو:

١- بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەر(ﷺ) یان هەندێك لەو شتانەی کە هێناویەتی.

٢- رق لێبونەوەی پێغەمبەر (ﷺ) یان هەندێك لەوشتانەی هێناویەتی.

٣- دڵ خۆش بوون بە ژێر کەوتنی ئیسلام، پیّ ناخۆش بوون بە سەرکەوتنی.

**جۆری دووەم**: دووڕوویی کردەوەیی (العملی):

وەکو: درۆ لەکاتی قسەکردندا، خیانەت کردن لەئەمانەت، پەیمان شکاندن، وگەورەکردنی کێشە.

# هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام
# (نواقض الاسلام)

١- هاوبەش پەیداكردن بۆ خودا لەعیبادەت كردندا هەروەكو خودای گەورە دەفەرموویت: (بەڕاستی خوا خۆش نابێت لەوەهاوەڵو شەریكی بۆ بڕیار بدرێت و جگە لەو (هاوبەش دانانە) لە گوناهی دیكە بۆ هەركەس بیەوێت وشایستە بێتو (پەشیمان بێتەوە) خۆش دەبێت، جا ئەوەی شەریك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات ئەوانە بەڕاستی گومڕابووە بەگومڕاییەكی زۆر دوور) (النساء : ١١٦).

٢- لەبەینی خۆتو خوادا (واسیطة) دا بنێیو لێیان بپاڕێیەوەو داوایان لێ بكەیو پشتی خۆتیان پێ ببەستی.

٣- موشریكەكان بە كافر نەزانی یان گومانت لەكوفرەكەیان هەبێت یان بۆچونیان بەراست بزانی.

٤- باوەڕت وابێ كە دینێكی تر یان بەرنامەیەكی تر یان بۆچونێكی تر لەهی پێغەمبەر (ﷺ) باشتر هەیە.

٥- رق لێبونەوە لەشتێك كە پێغەمبەر (ﷺ) هیناویەتی ئەگەر كاریشی پێ بكات.

٦- سوكایەتیو گاڵتە پێ كردن بەشتێك لەدینی ئیسلام هەروەكو خودای گەورە دەفەرموویت (هەركاتێك تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) لەگوفتاری نابەجێ یان ئاگاداردەبیت) ولێیان دەپرسین (ئەوا خەریكی چین) ئەوابێ گومان دەڵێن بەڕاستی ئێمە تەنها دەمەتەقێو

گەمەو گاڵتەمان دەکرد، پێیان بڵێ ئایا بەخواو و ئایەتو فەرمانەکانیو پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد، (ئیتر بێ سوودە)پاکانە مەکەن ، چونکە بەڕاستی ئێوە بێ باوەڕبوون دوای ئەوەی لەرواڵەتدا باوەڕتان هێنابوو ئەگەر لەدەستەیەکتان خۆش ببین (دوای تەوبەی راستەقینە) دەستەیەکتان هەر ئازار دەدەین (بەهۆی کاری نابەجێیەوە) چونکەبەڕاستی ئەوانە تاوانبارو گوناهکاربوون. (التوبە : ٦٥-٦٦).

٧- جادووکردن (السحر) هەروەکو هەروەکو خودای گەورە دەفەرمووێ: بەڵکو شەیتانەکان کافر بوونو (چونکە) خەڵکیان فێری سیحرو جادوو دەکرد. (البقرە: ١٠٢).

٨- پاڵپشتی کردنی کافرو موشریکەکان ویارمەتی دانیان بۆ زاڵ بوون بەسەر موسڵمانان وەکو هەروەکوخودای گەورە دەفەرموێ: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەنە یارو یاوەرو پشتیوانی خۆتان، ئەوانە هەندێکیان پشتیوانی و پشتگیری یەکترن، ئەوکەسەی پشت بەوان ببەستێت ئەوا هەر لەوانەو )حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت بەراستی خوا هیدایەتی قەومی ستەمکارنادات. (المائدە: ٥١).

٩- پشت تێ کردن لەدینو فێرنەبوونو عمل پێ نەکردنی، وەکو هەروەکو خودای گەورە دەفەرمووێ: (جاکێ لەو کەسە ستەم کارترە کەبەفەرموودەکانی خوا یاداوەریو ئامۆژگاری کرابێت، پاشان

پشتی لێ هەڵکردبێتو گوێ پێنەدان، بەڕاستی ئێمە تۆڵە لەتاوانبارو تاوانکاران دەستێنین. (السجده: ٢٢)

## تاغوت - طاغوت:

بریتی یە لەهەر دەرچونێکی عەبد لەسنوری خۆی چ لەپەرستن یان بەدواکەوتن یان گوێ رایەڵی کردن.

## تاغوتەکان زۆرن و سەرەکانیان پێنجن:

١-شەیتان (ابلیس) کە بانگەوازی کەرە بۆ پەرستنی غەیری خوای گەورە.

٢-دەسەڵات دارێکی ستەمکار کەوا حوکمی خودا بگۆڕێ.

٣-کەسێك حوکم بکات بە غەیری بەرنامەی خودا.

٤-کەسێك بانگەشەی زانینی غەیب بکات.

٥-کەسێك کەوا بپەرسترێو رازیش بێت بەو پەرستنە.

# پایەی دووەم:

## نـــــویـژ:

لەشـەرعدا مەبەسـت پێـی ئـەو راوەسـتانو قورئـان خوێنـدنو رکـوعو کڕنـوشو زیکرانەیـە کـە لەنویـژدا ئـەنجام دەدرێـت لەسـەر سـوننەتی پێغەمبـــــــەردا ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٢٧٧﴾ ﴾ البقرة: ٢٧٧

**واتــە**: بەراسـتی ئەوانـەی کـە باوەڕیـان هێنـاوەو کـردەوە چـاکەکانیان ئەنجام داوەو نوێژەکانیان بەچاکی بەجێ هێناوەو زەکاتیان داوە، تەنها پاداشتیان لای پەروەردگاریانە و ئەوسا نەترس و بیمیان لەسەرە نەغەم و پەراژە دەیانگرێتەوە..

نوێژ زۆربەی پەرستنەکانی دڵو وتەو کردار لەخۆ دەگرێت.

نوێژ واجیبە لەسەر موسڵمانان، نەکردنی سزای زۆر توندی بۆ هەیە.

﴿ مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ المـدثر: ٤٢ — ٤٣

**واتە**: ئەو چی بوو ئێوەی راپێچی دۆزەخ کردی بەکەساسییەوە دەڵێن ئێمە لەنوێژ کەران نەبووین.

# پایەی سێیەم:
# زەکات (الزكاة):

بریتی یە لەو بڕە سامانەی کە خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر دەوڵەمەندان بیدەن بەو کەسانەی کە شایەنی زەکات وەرگرتنن، وەکو لە قورئاندا هاتووە ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُوا۟ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ (البقرە: ٤٣).

**واتە**: نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن بەو دروشمەکانیەوەو زەکاتیش بدەن لەگەڵ کرنووش بەراندا کرنوش ببەن بۆ پەروەردگارتان.

پایەکی زۆر گرنگە لەئیسلام بۆیە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەیعەتی لەگەڵ نوێژ لەسەر وەرگرتووە.

# پایەی چوارەم:
# ڕۆژوو (الصيام)

خۆگرتنەوە لەخواردن و خواردنەوەو جووت بوون هەر لەبەیانیەوە تاکو ڕۆژ ئاوا بوون.

لەساڵی دووەمی کۆچی فەرزکرا لەسەر موسڵمانان قال تعالى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ ﴾ البقره: ١٨٣.

**واتە**: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژی ڕەمەزان لەسەرتان پێویست کراوە هەروەکو لەسەر گەلانی پێش ئێوە پێویست کرابو بۆ ئەوەی خواناس و پارێزگاری بکەن.



# پایەی پێنجەم:
# حەج کردن:

واتــە رووکردنــە مــاڵی خــوا (مەککــە) بەمەبەســتی خواپەرســتیو بەجێهێنانی دروشمەکانی حەج. لەسەر هەموو موسڵمانێك فـەرزە توانـای هەبوو (ماڵیو جەستەیی)، لەژیانیـدا لای کـەمی جارێـك ئـەنجامی بدات.

﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَـٰتٌۢ بَيِّنَـٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾ ال عمران(٩٦-٩٧).

**واتە**: بەڕاستی یەکەم خانەو ماڵو مەنزڵگەیەك کەبۆ خەڵکی دانرا لەسەر زەوی (بۆ خواپەرستی) ئەوەیە لەمەککەدایە کـە پـیرۆزەو هیـداتو ڕێنمـوویی بەخشە بۆ هەموو خـەڵکی جیهـان، لەوماڵـەدا کـە(کەعبـە) نیـشانەو بەڵگـەی زۆرو ئاشـکرا هەیـە کەیـەکێکیان شـوێنی تایبـەتی خواپەرسـتی ئیبراهیمـە هـەروەها ئـەوەی بـچێتە نـاوی پێویـستە ئـەمین و ئاسـوودەبێت لەهـەموو دەست درێژیەك جـا خـوای گـەورەش بڕیـاری داوە لەسـەر خـەڵکی حـەجو سـەردانی (بیــت الحــرام) بکــەن بەتــەنها ئەوانــەی کــەتوانای ( دارایــیو تەندورستیان) هەیە، جا ئەوەی کەباوەڕی نەهێناوە، ئـەوا بـابزانێ بەڕاسـتی خــــوا بــــێ نیــــازە لەهــــەموو خــــەڵکان پێویــــستی بــــە (چاکەو پەرستنی کەسی نییە)

**تێبینی**: بۆ زانیاری زیاتر لەپایەکانی ئیسلام جگە لەشەهادە بگەڕێوە بۆ کتێبەکانی فیقهی شەریعەت..

## سەرچاوە

١–التوحيد الميسر..........................عبدالله بن احمد الحويل

٢–تسهيل العقيده الاسلاميه.........................عبدالله جبرين

٣–التوحيد للناشئه والمبتدئين.................عبدالعزيز آل عبداللطيف

٤–الواجبات المتحتمات........................ الواجبات المتحتمات

٥–الاصول الثلاثة.................................. الاصول الثلاثة

٦–اصول الايمان.........................محمد بن صالح العثيمين

٧–پوختەی بیروباوەرو عەقیدە..................طارق حسن الهموندی

٨–چۆن منالآنمان فێری بیروباوەڕی ئیسلامی بکەین.......باوکی ئەسماء

٩–روونکردنەوەی بنچینەکانی باوەر...............و/جاسم عالآیی.

# ئادابی موسڵمان

## ئادابەکان لەگەڵ قورئان

١-سوننەتە لەشی پاك بێتو دەست نوێژی هەبێتو روو لەقیبلە بكاتو سیواك بەكاربێنێت و بەشێوەیەكی جوان دابنیشێ.

٢-بەخشوعو وردبونەوە لەئایەتەكان و بێ پەلە كردن بخوێنێ بەجۆرێك لەسێ رۆژ كەمتر خەتمێك نەكات.

٣-پێویستە قورئان خوێندنەكەی برازێنتەوە بە دەنگی خۆش چونكە خودای گەورە دەفەرموێ ﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا﴾ المزمل:٤٥.

**واتە**: دەوری قورئان بكەرەوەبەوردیو لەسەر خۆ

٤-پاش (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) سوننەتە لەسەرەتای هەموو سورەتێك (بسم الله الرحمن الرحيم) بخوێنێ تەنها لەسورەتی (التوبة) نەبێت.

٥-كاریگەر بێت بە ئایەتەكانی قورئان بە جۆرێك كە گەیشتە ئایەتێك باسی دۆزەخی كرد خۆی بە خوا لێی بپارێزێتو كە گەیشتە باسی بەهەشتیش داوای بكات لەخودا.

٦-واباشە بە دەنگێكی ئاشكرا بیخوێنێ تەنها ئەگەر ترسا لەریا یاخود تێكدانی نوێژ لەنوێژ خوێنان.

٧-رۆژانــە قورئــان بخوێنێــت ئەگــەر کــەمێکیش بێــت تــاکو لــەقورئان دانەبڕێت و ببێتە ئەهلو ئەصحابی قورئان.

٨-باشـترین کـات هەڵبـژێرین بـۆ قورئـان خوێنـدن وەکـو بـەیانیانو نـاو نوێژەکانو شەوان.

٩-دەتوانی لەکاتی قورئان خوێندن وەڵامی سەلام بدەیەوە، و(الحمد لله) بۆ پژمین بکەی.

١٠-هەوڵبدە لەمانای ئایەتەکان بگەیو کاریان پێ بکەیت.

١١-ئەگەر قورئان خوێندرا بێ دەنگ بنو گوێی لێ رابگرین.

## ئاداب لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)

١-خوێنـدنی ژیـانیو پەنـد وەرگـرتن لەتێکۆشـانو بەسـەرهاتو ئـازارو خۆشی و ناخۆشیەکانی.

٢-کـارکردن بــە فەرمانــەکانیو دوورکەوتنــەوە لەنەهیــەکانیو زینــدوو کردنەوەی سوننەتەکانی.

٣-باوەڕ بوون بە هەموو ئەو هەواڵانەی کە داویەتی چونکە هیچ شـتێکی لەخۆیەوە نەگوتووە بەڵکو هەمووی وەحیەو لەلایەن خوداوەیە.

٤-دەبێت کەسی تر ت بە قەدەر پێغەمبەر (ﷺ) خۆش نـەوێت، خـۆش ویستنی ئەو کەسەی خۆشی دەویو رق لێبونەوەی ئەو کەسەی کـە رقی لێ دەبێتەوە.

٥-مەدحو ستایش کردنو سەڵاوات لێدان لەسەری کاتێك ناوی دەبیستی لەهەموو کاتێکو بەتایبەتی لەرۆژی هەینی.

٦-خۆش ویستنی ئەهلو بەیتی پێغەمبەر(ﷺ)و گشت هاوەڵەکان (صەحابەکان)و تەنها بەباشە باسیان بکەیت چونکە خۆیان بە خوێن و ماڵ لەپێناو دین بەخشی.

٧-بەرزو جوان راگرتنی فەرموودەکان لەکاتی باس کردنو گوێ گرتنی.

٨-دەبێ باوەڕت وابێ کە پێغەمبەر(ﷺ) زاناترین کەسە ، راستگۆ ترینیانە، باشترین مامۆستایە بۆ جیهان.

## ئادابی گفتوگۆ

١-پێویستە موسڵمان بزانێت هەموو ئەو ووشانەی دەیڵێت دەنووسرێتو لێپێچینەوەی لەسەر دەکرێت.

٢-پێویستە هەردەم راستگۆبێتو قسەی جوان و خێر بکات ئەگەر نا بابێ دەنگ بێت.

٣-پێویستە کەم قسە بکات و زمانی پاراو بێت بە زیکری خودا.

٤-نۆبەدان بەکەسی بەرامبەری، گوێ گرتن لێیو رووخۆشی و خۆ بەگەورە نەزانین بەرامبەری و نەپچڕاندنی قسەکانی.

٥-ئەگەر سێ کەس بەیەکە بوون نابێت دوانیان بە نهێنی قسە بکەن.

٦-نابێت کردارێکی وا بکات بە پێچەوانەی قسەکانی بێت چونکە قسە هەڵقوڵاوی ناخو دڵە.

٧–پێویستە زمانی شیرین بێت‌و نەرم‌و نیان بێت لەکاتی ئامۆژگاری کردن، قسەکانی لەئاستی گویٚ گر بێت.

٨–لەکاتی گفتوگۆی نێوان ژن‌و پیاوانی بێگانە دا دەبێت بە پێی پێویست و لەسنوری یاسای شەرع دەرنەچێت.

٩–خۆ دوور خستنەوە لەئافاتەکانی زمان بە گشتی وەکو (غەیبەت، نەمیمەت، سوێندی بە درۆ، گۆتە گۆت...).

## ئادابی دانیشتن‌و مەجلیس

١–روخسەت خواستن‌و سەلام کردن‌و دانیشتن لەو شوێنەی کە گونجاوەو خاوەن ماڵ بۆت دیاری دەکات.

٢–ئازار نەدانی کەس‌و نەچێتە نێوان دوو کەس بەبیٚ روخسەت.

٣–زوو رۆیشتن پاش تەواو بوونی میوانداری و کارەکانت.

٤–فەرامۆش نەکردنی یادی خودا لەهەر مەجلیسێك ئەگەر نا دەبێتە پەشیمانی لەرۆژی دوایی.

٥–نابێت لەمەجلیسێك بمێنیتەوە خراپەی تێدابوو کە نەتوانی بیگۆڕی.

٦–پاراستنی ئەمانەتی ناو مەجلیس و بڵاونەکردنەوەو خۆ توش نەکردن بە نەمیمەت.

٧–باشترین مەجلیس لەسەر رووی زەوی ، مەجلیسی صالحان و قورئان و دەرس خوێنانە.

٨–لەکاتی هەڵسان خوێندنی دوعای کەفارەتی مەجلیس (سُبحانَكَ اللهمَّ وَبِحمدِكَ أشهدُ أنْ لا إلـه إلا أنْتَ أستَغْفِرُكَ وَأتوبُ إليكَ) (الصحيح الترمذي).

## ئادابی سەردان و میوانداری

١–سەردان کردن بە مەبەستی ڕەزامەندی و نزیك بونەوە لەخودا بێت.

٢–ڕەچاو کردنی کاتی گونجاو بۆ سەردان کردن‌و خۆدوورخستنەوە لەم کاتانە (پاش نوێژی بەیانی، نیوەڕۆو، درەنگی شەو).

٣–لەدەرگادان تاکو سێ جار ، چاوەڕێ بکە ئەگەر نا بگەڕێوە، نابێ بەرامبەر دەرگا بوەستی سەیری ناو ماڵ بکەی، ئەگەر گوتیان کێ یە؟ مەڵێ منم بەڵکو ناوی خۆت بڵێ.

٤–ئامان نەکەی بچیە ژوورەوە ئەگەر خاوەن ماڵە کە لەماڵ نەبێت ئەگەر فەرموشیان لێ کردی.

٥–بەڕێزەوە بچۆ ژورەوە و پێش خاوەن ماڵ نەکەوی ، چاوت بپارێزەو دەنگت نزم بکەو لەو شوێنەشە کە خاوەن ماڵ بۆت دیاری دەکات و دەست کاری نەکردنی کەل‌و پەلی ماڵەکە.

٦–نیشاندانی خۆشحاڵی‌و شادمانی بۆ میوان.

٧–ناساندنی ژووری پێشوازی، پاشان ئاودەست، شوێنی دەست نوێژ، ڕووی قیبلە.

٨–ڕازاندنەوەی سفرە بەبێ زیدەڕۆیی‌و فەرموو لێ کردن، نەکەی پێش میوان دەست لەخواردن هەڵگری.

٩-دوعا کردن بۆ خاوەن ماڵ (اللهم بارِكْ لَهمُ فيما رَزَقْتَهُم وَاغفِرْ لَهمُ وَارْحَمهم) (مسلم).

١٠-گەر سەردانی نەخۆشت کرد زۆر دامەنیشە، دوعای خێری بۆ بکە، و دڵی بدەوە با سەبر بگرێت.

## ئادابی خواردن و خواردنەوە

١-بەدەستهێنانی خواردنی حەلال و پاك و دوورکەوتنەوە لەهەموو حەرامێك (ریبا، دزیاری،...).

٢-مەبەستی لەخواردن و خواردنەوەکەی توانا گرتن بێت بۆ خوداپەرستی و کاری چاکە.

٣-دەستەکانی پێش نان خواردن بشوات ئینجا (بسم الله) بکات و ئەگەر لەبیریشی کرد کەی بەبیری هاتەوە بلێت (بسم الله أوّلَهُ وآخِرَهُ) أبوداود والترمذي -صحيح-

٤-رازی بێت بە خواردنەکەو زەمی نەکات ئەگەر شتێکی بە دڵ نەبوو با نەیخوات.

٥-ئەوەی لەبەردەمی خۆی و بەدەستی راست بە سێ پەنجە بخوات لەپاشان بیان لێستەوە و فوونەکردن لەخواردن و خواردنەوەی گەرم.

٦-زۆر نەخواردن بەتایبەتی پێش نوستن، ئەگەریش کرا میوە پێش خواردن بخورێ.

٧-دانیشتن بە شێوەیەکی جوان و پاڵ نەکەوتن ، نە خواردن و نەخواردنەوە بەپێوەو بەرۆیشتن.

٨-سوپاسی خودا بکەین لەسەر ئەم خواردنەو بڵێین: (الحمدُ لله الذي أطْعَمَني هذا وَرَزَقَنيه مِنْ غَيرِ حَولٍ مِنّي ولاقوة)) رواه الترمذي وأبو داود -صحيح-.

## ئادابی نوستن

١-دوانەخستنی نوستن لەدوای عیشا تەنها ئەگەر پێویست بێت وزیادە رۆیی نەکردن لەنوستن و زوو هەڵسان لەبەیانیان.

٢-هەوڵ بدە بەدەست نوێژو لەسەر لای راست بخەوی ، خۆ دوورخستن لەنوستن لەسەر سك.

٣-خوێندنی زیکرەکانی پێش نوستن .

٤-داوەشاندنی جێگاکەتو کوژاندنەوەی گلۆپەکانو سۆبەو داخستنی دەرگاکان.

٥-ئەگەر کرا پاش نوێژی بەیانیان نەخەویەوە چونکە خێرێکی زۆر لەم کاتەدا هەیە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ (اللهم بارك لأمتي في بكورها) رواه ابن ماجه -صحيح-

٦-جیاکردنەوەی جێگای منداڵەکان لەدەساڵیەوە.

٧–ئەگەر خەونێکی خۆشت بینی بۆ خۆشەویستەکانت بگێڕەوە، ئەگەریش ناخۆش بوو سێ تف لەلای چەپ بکەو بڵێ (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) بۆ کەسیش نەیگێڕیتەوە.

٨–لەکاتی بەخەبەر هاتن سوپاسی خودا بکەو بڵێ (الحمدُ للهِ الذي أحيانا بَعدَ ما أماتَنا وإليهِ النشور ) البخاري ومسلم.

## ئاداب لەگەڵ دایك و باوك

١–ڕووخۆشیو نەرمو نیانی دەم بە خەندەبوون و دەرنەبڕینی ناڕەزایی بەرامبەریان تەناتەت (ئۆف) یش.

٢–گوێڕایەڵی کردنیان لەچاکەو سەرپێچی نەکردنیان مادام بێ ئەمری خودا نەبێت.

٣–ئەوپەڕی ڕێزگرتن لێیان بەوەی بە ناوی خۆیان بانگیان نەکەی، بڵێ (بابە– دایکە) لەسەروی وان دانەنیشی لەمەجلیس، لەڕۆیشتن پێشیان نەکەوی.

٤–کاتێك کە پیربوون بەوپەڕی جوانی خزمەتیان بکەی ، منەتیان لەسەر نەکەی، یارمەتیان بدەی لەکارەکانیان ، دەنگیان لەسەر بەرز نەکەیەوە.

٥–دوای مردنیان پێویستە وەسیەتیان جێ بەجێ بکرێ، دووعاو داوای لێخۆشبونیان بۆ بکرێت، ڕێز لەهاوڕێکانیان بگرین.

## ئادابی رۆژی هەینی

١–خۆشوشتن‌و لەبەرکردنی جوانترین جلك‌و خۆ بۆن خۆش کردن پێش چوونە وتاری هەینی (خوتبە).

٢–زۆر سلاوات لێدان لەم رۆژە، خوێندنی سورەتی (الکهف) چونکە دەبێتە نور تاکو هەینی داهاتوو.

٣–زوو رۆیشتن بۆ مزگەوت و ئازار نەدانی خەڵك بەوەی کە بەسەریان باز بدەی.

٤–بەوریاییەوە گوێ لەووتار بگری‌و خۆت خەریك نەکەی بە هیچ شتێك.

٥–زۆر دوعاکردن لەرۆژی هەینی، چونکە کاتێکی هەیە دوعا تێدا رەت ناکرێتەوە.

## سەرچاوەکان

١–آداب إسلاميه/ محمد احمد عبود

٢–الجامع لاداب الاسلام /أبو إسلام سيد بن عمر بن عبداللطيف

٣–پوختەی ئادابە ئیسلامیەکان بۆ نەوجەوانان/ سۆران عباس.

# سیرەی سەروەرمان محمد (صلی الله علیه وسلم)

## سیرەی سەروەرمان (ﷺ)

**پێناسەی (سیرە):**

واتە: باس کردن لەڕێرەوو ڕێگای ژیانی محمد ﷺ هەر لەدایك بوونی تا مردنی لەگەڵ پەندو ئامۆژگاری و ئادابو رەوشتەکانی.

**گرنگی:**

خوێندنی سیرە گرنگە بۆ موسڵمانان تاکو بتوانن ژیانی خۆیان ڕێك بخەنوشوێنی پێغەمبەر (ﷺ) بکەون.

**نـــــــاوی:**

محمدﷺ کوڕی عبدالله کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشم کوڕی عبدالمناف لەنەوەی عدنانە، و عدنانیش نەوەی پێغەمبەر اسماعیل کوڕی پێغەمبەر إبراهیمە (علیهما السلام).

دایکی ناوی آمینە کچی وهبی کوڕی عبدمناف، هەروەها لەشاری مەککە لەدایکبووە لەهۆزی (قریش)ە.

**لەدایك بوونی:**

لەمانگی ربیع الاولی ساڵی فیل، ئەو ساڵە بوو کە ئەبرهە هێرشی کردە سەر شاری مەککە و سوپاکەی تێك شکاو کە چەندین فیل تێدا بوو واتە لە٥٧١ی زایینی لەدایك بووە.

**دایەنی:**

یەکەم کەس شیری پێدا پاش دایکی ناوی (ثوەیبە) بووپاشان حلیمە کچی أبی ذؤیب لەبەنی سەعد دایەنی کرد لەنزیك مەککە.

**دووبارە بۆ دایەنی:**

لەتەمەنی دووساڵیدا گەڕاندیەوە لای دایکی بەڵام جەختی کرد کە دووبارەبیباتەوە، تاوەکو زیاتر جەستەی توند بێت دووربێت لەنەخۆشی چونکە منداڵێکی بەبەرەکەت بوو نزیکەی دووساڵی تریش لەلای مایەوە تا ڕووداوی (شق الصدر) ئینجا گەڕاندیەوە لای دایکی.

**وەفاتی دایكوبا پیری:**

لەتەمەنی (٦) ساڵان بوو دایکی سەردانی خاڵوانی کرد لە(مەدینە) لەرێگای گەڕانەوەدا دایکی وەفاتی کرد.

کەوتە لای (عبدالمطلب)ی باپیری لەلای مایەوە تا وەفاتی باپیری کە لەتەمەنی (٨) ساڵیدا بوو.

**کەوتە لای مامی:**

پاشان کەوتە لای (أبو طالب) مامی کە مامی توانای دارایی کەم بوو بۆیە پێغەمبەر ﷺ کاری شوانی دەکرد تالەتەمەنی دوازدەساڵیدا مامی لەگەڵ خۆیدا بردی بۆبازرگانی لەولاتی شام.

**جەنگی فوجار:**

لەتەمەنی (١٥) ساڵیدا بەشداری جەنگی (فجار)ی کرد کە بە ملی هۆزی قورەیش داهاتبوو لەم جەنگەدافێری ئازایەتی‌و چەندین وانەی تر بوو.

**هاوپەیمانی فضول:**

پاشان هاوپەیمانی (فضول) بەسترا کە تێیدا پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هۆزەکان بەشداربوو کە رێککەوتن لەسەریارمەتی دانی هەژارانوستەم لێکراوان، ئەمەش راهاتنێك بوو بۆ پێغەمبەر لەسەر سەرخستنی حەق دژ بەستەم کاران.

بۆ جاری دووەم لەتەمەنی (٢٥) ساڵیدا دەچێتە شام بۆبازرگاری کردنی بەسامانی (خدیجەی کچی خوەیلد) کە یەکێك بوو لەئافرەتە ناودارو دەوڵەمەندی مەککەو بێوەژن بوو، لەگەڵ مەیسەرەی خزمەت کارەکەی ، پاش گەڕانەوەی خدیجە دەست پاکی‌ورەوشت بەرزی ئەوی بۆباس کرا بۆیەپلانی دانا و ناردی بەدوایداو داوای کرد تا ببێتە هاوسەری.

## خێزان و منداڵەکانی:

پێغەمبەریش رازی بوو لەگەڵ خزمانی چوون بۆ داوای خەدیجە کە دایکە خەدیجە لەخۆی گەورەتربوو، ئەمەیەکەم خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، ژیانێکی خۆش‌وکامەرانیان بەسەر برد، ئەم منداڵانەیان بوو قاسم – عبدالله – زینب – روقیە – أم کەلسوم – فاتیمە هیچ ژنێکی تری نەهێنا تاوەکو وەفاتی دایکە خەدیجە (خودا لەهەموویان رازی بێ).

## کێشەی کەعبە:

پاش ئەوەی بە هۆی لافاوەوە هەندێك لە کەعبە رووخا هۆزەکانی مەککە هەستان بە دووبارە چاك کردنەوەی بەڵام بۆ دانانەوەی (حجر الاسود) لەشوێنی خۆی بووە کێشەیان، پێغەمبەر(ﷺ) بووە ناوبژیوانیان وئەم کێشەی بۆیان چارەسەرکرد.

## گۆشەگیری لە حیراء :

ماوەیەك بوو لەرەمەزانان دەچووە ئەشکەوتی حیراء خەڵوەتی دەکرد لەسەرئایینی إبراهیم پێغەمبەر علیه السلام بیری لەژیانی جاهیلی گەلەکەی دەکردەوە تا گەیشتە چل ساڵی لەرەمەزانی ٦١٠ زایینی فریشتەی وەحی جبرائیل دابەزیو سەرەتا بە (إقرأ) قورئان هاتە سەر زەوی.

## گەڕانەوە پاش وەحی:

كاتێـك گەڕایـەوە بـۆ ماڵـەوە زۆر بـە پەشـۆكاوی فەرموویـە دایكـە خەدیجە (زملونی ) یان (دثرونـی) واتـە: لـولم بـدەن، دام پۆشـن، دایكـە خەدیجە زۆر دڵی دایەوەوئارامی كردەوە.

فەرمووی: بـە خـوا، خـوا هـەرگیز سەرشـۆڕت ناكـات، تـۆ پەیوەنـدی خزمایەتی بە جێدەهێنیت، یارمەتی نەدار دەدەیت، هەژار تێر دەكـەیت، ورێز لەمیوان دەگریت، ویارمەتی لێقەوماوان دەدەیت.

## مژدەی پێغەمبەرایەتی:

دایكە خەدیجە لەگەڵ خۆی بردیـە مـاڵی (وەرەقـەی كـوڕی نـەوفل)ی ئـامۆزای كـە پیـاوێكی زانـاو شـارەزابوو لەكتێبـە ئاسمانیـەكان ، پـاش گێڕانەوەی بەسـەرهاتەكە فـەرمووی موحەممـەد بویتـە پێغەمبـەری ئـەم ئوممەتە ، خۆزگە گەنج بومایـە كاتێـك قەومەكـەت دەرت دەكـەن پـشتم بگرتبایـت وەكـو پێغەمبـەرەكانی پێـشوو ئـازاردران و دەركـران لـەناو گەلەكانیان.

## یەكەمەكانی موسڵمان بوون:

سەرەتای موسڵمان بوون لەژنان خەدیجە لـەپیاوان أبـوبكر لەمنـدالآن علـی كـوڕی ئـەبوتالب لەگـەنجانیش خزمەتكارەكـەی زەیـدی كـوڕی حاریسە. (خوداڵێیان رازی بێت)

پاشان پیاو ماقولان (عوسمانی کوڕی عەففان، زوبێری کوڕی عەوام، عبدالرحمن ی کوڕی عەوف، سعدی کوڕی أبو وقاص، تەڵحەی کوڕی عبیدالله أبوعبیدەی کوڕی جەڕراح، ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم، عوسمانی کوڕی مەظعون ، عوبیدەی کوڕی حارث، سعیدی کوڕی زەید، خبابی کوڕی أرت، عبدالله ی کوڕی مەسعود، عمّاری کوڕی یاسر، صوهەیبی رۆمی).

لەئافرەتانیش (أم أیمن، أم الفضل، أسماء کچی أبوبکر) خودا لەهەموویان رازی بێت.

**بانگەواز:**

سێ ساڵ بە نهێنی لەماڵی (ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم) بانگەوازیان دەکردو کۆدەبوونەوە.

پاشان بە ئایەتی ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ الحجر: ٩٤ بانگەوازەکەی ئاشکرا کرد.

**واتە:** هەر فرمانێك پێ دراوە (ئەی محمد ﷺ بەرێك و پێکی ئەنجامی بدەو گوێ مەدە بەبوختان و رەفتاری موشریك و هاوەڵگەران.

**ئازارو کۆچ کردن:**

گەلەکەی دەستیان کرد بە ئازار دانیان و لێدان و ئاوارەکردنو تالآن کردنو بەندکردنو کوشتنیان، موسڵمانان زۆر هەستیان بە نائارامیو

مەترسی بۆ سەر دینەکەیان دەکرد بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) لەساڵی (٥)می پێغەمبەرایەتی فەرمانی کرد بە لاوازو بێ کەسەکان بڕۆن کۆچ بکەن بۆ وڵاتی حەبەشە چونکە لەوێ پاشایەکی دا دپەروەری لێیە لەسایەیدا ستەم لەکەس ناکرێت.

## کۆچ بۆ حەبەشە:

پاشاکەی حەبەشە نەصرانی بوو ناوی (أصمعه)ی نەجاشی بوو ، کۆچکەران (١٤-١٦) کەس بوون ، جاری دووەم (١٠١) کەس بوون بە منداڵەکانیشەوە.

## بەیاننامە بە ئازارەکە:

موشریکەکانی قورەیش هەوڵیان دا کۆچکەران بگێڕنەوە بەلاّم نەجاشی رازی نەبوو بەشکست خوراوی گەڕانەوە مەککەو ئینجا موشریکەکان بەیاننامەیەکیان دەرکرد کە کەس کڕینو فرۆشتنو ژنو ژن خوازیو گفتوگۆ لەگەڵ بەنو هاشم نەکات.

## دڕاندنی بەیاننامەکە:

پاش (٣) ساڵ چەند گەورە پیاوێکی قورەیش بەیاننامەکەیان لەدیواری کەعبە دڕاند و کۆتاییان بەمە هێنا.

**غەمباری پێغەمبەر ﷺ:**

لەم کاتە سەختانەدا دایکە خەدیجەو ئەبو تالیبی مامی بربڕەی پشتی پێغەمبەر ﷺ بوون هەردووکیان لەیەك ساڵدا وەفاتیان کرد ئەو کاتە تەمەنی پێغەمبەرﷺ نزیکەی (٥٠) ساڵ بوو، کافرەکان یەکجاری دەستیان کرد بە ئازاردانی خۆیو هاوەڵەکانی ، بە وەفاتی ئەم دوو کۆڵەکەیە هەرچەندە (ئەبو تالیب) بە کافری مرد و پێغەمبەر ﷺ داوای لێ کرد تەنها لا إله إلا الله بڵێ تاکو شەفاعەتی بۆ بکات لای خودا بەلآم گەورە پیاوەکانی کافر ووتیان چۆن دەبێ واز لەدینی بابو باپیرانت بێنێ.

**تائیف:**

پێغەمبەرﷺ بە نیازی بانگەوازو شوێنێك بوو بۆ موسڵمانان بدۆزێتەوە ئەوەبوو لەساڵی (١٠) ی پێغەمبەرایەتی لەگەڵ زەیدی کوڕی حاریسە بەرەو تائیف کەوتنە ڕێ، (١٠) ڕۆژ خەریکی بانگەواز بوو بەلآم خەڵکی تائیف بە بەرد بارانو گاڵتە کردن وەلآمیان دایەوە.

هەندەیان لێدان تاکو خوێن گەیشتە نێو نەعلەکانی پێغەمبەرﷺ بەو ئازارو دەرکردنو دڵشکاویە لەتائیف دەرچوو دەستی کرد بە پاڕانەوە و وتی خودایە ئەمانە ئازار مەدە چونکە نازانن بە تەنها خودا بپەرستن. لەوەلآمی (ملك الجبال)ش دافەرمووی ئومێد دەکەم لەپشتی ئەمانە نەوەیەك بخاتەوە بە تەنها خودا بپەرستن.

ئەوەبوو بە دالّدەی (مطعم کوڕی عدی) گەڕایەوە ناو مەککەو کەس نەیتوانی ڕێی لێ بگرێ.

## شەو ڕەوی:

پێغەمبەرﷺ لەسەر زەوی زۆر ئازار دەدرا بێزاریان کردبوو بۆیە خودای گەورە گەشتێکی ئاسمانی پێ دەکات واتە (الاسراء والمعراج) لەم شەوەدا بە لاشەو بە گیان چووە بۆ قودس – بیت المقدس– و پاشان بۆ ئاسمانەکان و بینینی مەلائیکەتانو پێغەمبەران و هەر حەوت چینی ئاسمان و بەهەشت و جەهەننەمو هەر لەم شەوەشدا هەر پێنج نوێژەکەی ڕۆژانە فەرزکرا.

## شەش گەنجە خەزرەجیەکە:

پاشان دەستی کرد بە بانگەوازی تاکەکانو خێلەکانو پاشان لەساڵی (١١)ی پێغەمبەرایەتی لەوەرزی حەجدا پێغەمبەرﷺ لەگەڵ شەش گەنجی خەزرەجی لەمینا دادەنیشێو هەموویان موسڵمان دەبن.

## پەیمانی عەقەبە:

لەساڵی دوایی (١٢) کەس لەخەڵکی یەثریب لەئەوسو خەزرەج هاتن پاش کۆبوونەوە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ موسڵمان بوونو ناونرا بە بەیعەتی عەقەبەی یەکەم و موصعەبی کوڕی عومەیری لەگەڵ ناردن و


بانگەوازەكەی موصعەب فراوانو بەبەرەكەت بوو ساڵی داهاتوو هەر لەوەرزی حەجدا ساڵی (١٣)ی پێغەمبەرایەتی زیاتر لە(٧٠) كەس دەبوون هاتنەوە بەیعەتی عەقەبەی دووەمیان بەست لەسەر خۆشیو ناخۆشیو پاراستنی پێغەمبەرﷺ و موسڵمانو ماڵو منداڵیان بە خوێنو لاشە ئامادەییان دەربڕی لەسەر بەخێرهاتنیان بۆ (یەثریب) – مەدینە – تاكو لەو ئازارانە رزگاریان ببیو بانگەوازەكەیان زیاتر بڵاو بكەنەوە..

## دابەزین لەقوبا :

پاش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) كێوی (ثور)ی بەجی هێشت بەرەو مەدینە كەوتەرێ تاكو گەیشتە (قوباء) زۆر ماندو بوو لەماڵی (كلثوم بن الهدم) دابەزی، دەستی كرد بە دروست كردنی مزگەوتێك كە ئەمەش یەكەم مزگەوت بوو لەئیسلام.

## چوونە مەدینە :

پاش ئەوەی كە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبكر گەیشتنە مەدینە خەڵكی مەدینە زۆر بە گەرمی پێشوازیان لێكردن یەكەم كاری پێغەمبەر (ﷺ) دروست كردنی مزگەوتی مەدینە بوو كە زەویەكەی لەدوو منداڵی هەتیو كڕی، كە خۆشی بۆ دروست كردنی كاری تێدا كرد.

پاشان هەر کۆچ کەرێکی کردە برای پشتیوانیەك پاش ئەوەی کە ئەوس و خەزرەجی کردەوە برا پاش چەندین ساڵ کوشتن و برین لەنێوان ئەم دوو هۆزەی مەدینە.

ناوی شارەکەشی گۆری لەیەثریبەوە بۆ مەدینە لەگەڵ دانانی دەستور ویاسایەکی پتەو بۆ خەڵکی ئەم شارە.

**بانگو رووگە ( قیبلە ):**

رۆژانــە خــەڵك كۆدەبونــەوە بــۆ نوێــژ لەمزگــەوت رووشــیان لــە(بیــت المقدس) دەكرد پاشان بانگ دانرا (بەم شێوەیەی ئێستا) قیبلە گۆڕا بۆ كەعبەی پیرۆز كە ئەمەش لەساڵی (٢)ی كۆچی بوو.

**جەنگ:**

پاش ئەوەی موسڵمانان ئازارو ئەشكەنجەی زۆریان چەشت بەدەست لێدان و تالآن كردنی كافرەكان، خوای گەورە لەساڵی (١)ی كۆچی ئیزنی دان كـاری سـەربازو جـەنگ بـۆ پاراسـتنی مـافـو سـامانی خۆیـان بۆیـە پێغەمبەر (ﷺ) هەڵسا بە رەوانەكردنی چەند سریەیەك.

**جەنگی بەدری گەورە لە( ٢ )ی كۆچی:**

ئەمە یەكەم جەنگ بوو لەنێوان موسڵمانان و كافران روویدا ئـەوە بـوو موسڵمانەكان كە زانیان ئەبوسوفیان بەكاروانێكی بازرگانی گەورە لەشام دەگەڕایەوە بەرەو مەككە پێغەمبـەر (ﷺ) بـۆ سـەندنەوەی ئـەو هـەموو مافــە زەوت كــراوەی كۆچــكەرەكان، بۆیــە بــەخۆیو ســوپایەك بــۆی دەرچـوون، كـە ئەبوسـوفیان ئـەم هەواڵـەی نـاردە مەككـە تـاكو فریـای كاروانەكـەیان بكـەون، بەخۆشـی ڕێگاكـەی بـەرەو كـەنار دەریـا گـۆڕی، كافرەكانی مەككە بە هەزار چەكدارەوە دەرچوون لەگەڵ گەورە پیـاوانی قورەیش بەسەركردایەتی (ئەبو جهل). لەو كاتــەدا موسـڵمانان ژمارەیـان

(٣١٤) جەنگاوەر بوو، بەیەك گەیشتن لەبەدر. پاشان زۆرانبازی شەرەكە هەڵگیرسا و خوای گەورە مەلائیكەی دابەزاندو موسڵمانان سەركەوتن كەتێیدا (٧٠) كافر بە دیل گیران و (٧٠)ش كوژران لەمان (أبو جهل – أمیه كوڕی خلف – عتبه – شیبه – ولید كوڕی عتبه).

وەلەموسڵمانانیش (١٤) كەس شەهید بوون، پاش سەركەوتنێكی گەورە بە دەست كەوتێكی زۆرو بەسەر بڵندی گەڕانەوە مەدینەی پیرۆز.

## جەنگی ئوحد لە (٣)ی كۆچی :

كافرەكانی مەككە بۆ تۆڵەسەندنەوە هەڵسان بە ئامادەكردنی (٣) هەزار شەڕكەر بەسەركردایەتی (أبوسفیان) بەرەو مەدینە بەڕێ كەوتن.

لەولاشەوە پێغەمبەر (ﷺ) بە (هەزار) جەنگاوەرەوە لەنیوەی شەودا بەرەو ئوحد دەرچوون هەر چەندە عبدالله كوڕی ئوبەی دووڕوو (منافق) پاش گەزبۆوەو بە (٣٠٠) دووڕووەوە گەڕانەوە مەدینە.

كاتێك گەیشتنە ئوحد پێغەمبەر (ﷺ) سوپاكەی دابەش كرد (٥٠) تیر هاوێژی لەسەر بەرزایی (عینین) دانا بەسەركردایەتی عبدالله كوڕی جبیر فەرمانی پێكردن كە دانەبەزن ئەگەر ئێمە ژێركەوتین یان سەركەوتین. ئینجا شەڕەكە دەستی پێكرد لەسەرەتادا موسڵمانان سەركەوتن كافرەكان هەڵاتن، تیر هاوێژەكان كە زانیان كافرەكان شكان یەكسەر لەكێوەكە هاتنە خوارێ تەنها سەركردەكەو چوار كەس مانەوە.

کافرەکان ئەمەیان قۆزتەوەو بەسەرکردایەتی (خالیدی کوڕی وەلید) بەپشت کێوەکە سوڕانەوە و پشتیان لەموسڵمانان گرتو موسڵمانان توشی شکست هاتن کەتێیدا (٧٠) لەموسلمانان شەهید کران لەوان هەڵگری ئاڵای موسلمانان مصعب کوڕی عمیر لەگەڵ حمزەی مامی پێغەمبەر (ﷺ) بە دەستی وەحشی وخودی پێغەمبەریش (ﷺ) بریندار بوو لەشەڕدا و لەکافرەکانیش (٢٢) کەس کوژران.

## جەنگی خەندەق لە(٥)ی کۆچی:

جولەکەکان لەرق و تۆڵەی خۆیان نەیان ویست موسڵمانەکان بەهێز بن بۆیە لەگەڵ کافرەکان رێکەوتن تاکو هێرش بکەن و مەدینە داگیر بکەن ئەوانیش لەلای خۆیان سەریان بخەن.

ئەمجارە سوپای کافرەکان و چەندین هۆزی تری عەرەب ژمارەکەیان (١٠) هەزار کەس بوو بەسەرکردایەتی ئەبوسوفیان بەرەو مەدینە بەڕێ کەوتن.

پێغەمبەر (ﷺ) بەمەی زانی بە پێشنیازی سەلمانی فارسی هەڵسان بەهەڵکەندنی خەندەقێك لەدەوری مەدینە سوپای موسڵمانەکانیش خۆیان کۆکردەوە کە (٣) هەزار کەس بوون، هەرچەندە بەکاتێکی زۆر ناخۆش و ترسناك و سەخت تێپەڕین بەڵام لەکۆتاییدا نەصرەتی خودا دابەزی و موسڵمانەکان سەرکەوتن و کافرەکانیش بەشکست خواردوویی گەڕانەوە مەککە.

**هۆكاری سەركەوتنەكە:**

١-هەڵكەندنی ئەم خەندەقە كە بەلای عەرەب شتێكی نامۆ بوو.

٢-هەڵكردنی رەشەبایەكی زۆر بەهێزو سارد كە چادرەكانی لێ هەڵكەندن و ترسێكی زۆر بەهێزی خستە دڵیان و پەرت و بڵاوی كردن.

٣-هەڵسانی (نوعەیمی كوری مەسعود) تازە موسڵمان بوو بە خستنەوەی دووبەرەكی لەنێوان جولەكەو كافرەكان.

**كۆتایی هاتنی جولەكە لەمەدینە:**

پاش دەركردنی بەنو قینقاع و بنو النضیر لەمەدینە كۆتایی جولەكە بە نەمانی بنوقریظة هات چونكە یارمەتی كافرەكانیان دابوو لەجەنگی ئەحزاب، كە لەم بنبڕكردنەدا سەدان جولەكەیان لەناو برد بەسەرۆكایەتی علی كوری أبی طالب كە (٢٥) رۆژ گەمارۆی دان، ئیتر هیچ جولەكەیەك لەمەدینە نەما، دەستی خیانەت و ئاژاوەگێڕیان كۆتایی هات.

**رێكەوتنامەی حودەیبیە لە(٦)ی كۆچی:**

پاش ئەوەی دەوڵەتی ئیسلامی ترسی نەما، پێغەمبەر (ﷺ) بە (١٤٠٠) لەهاوەڵان بەرەو مەككە بەرێ كەوتن بەمەبەستی عەمرە، ئوم سەلەمەی دایكی ئیمانداارنی لەگەڵ خۆبرد، بەلام كافرەكان رێگریان لەموسڵمانەكان كرد بچنە ناو مەككە پێغەمبەر(ﷺ) عثمان كوری عفانی نارد بۆ لایان تاكو راستیەكەیان تێبگەینی عثمان لەگەڕانەوە دواكەوت

موسڵمانانیش وایان زانی كە شەهید كراوە بۆیە لەژێر دارێك هەر هەموویان پەیمانی مردنیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ سەندنەوەی خوێنی عثمان كە ئەمەش ناونرا بە (بیعه الرضوان)، كافرەكان بەمەیان زانی زوو عوسمانیان رەوان كردەوەو هاتن پەیمان نامەی حودەیبیەیان بەست كە لەنێوان پێغەمبەر (ﷺ) و سەهلی كوری عەمر مۆركرا لەسەر ئەم خاڵانە:

١–موسڵمانان ساڵی داهاتوو بێن عەمرە بكەن نەوەك ئەمساڵ و بەبێ چەك بێن.

٢–شەڕ راگرتن لەنێوان هەردووكیان بۆ ماوەی (١٠) ساڵ.

٣–هەردوولا دەتوانن هاوپەیمانی لەگەڵ هۆزەكانی تر ببەستن.

٤–هەر كەسێك لەقورەیش بچێتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە دەبێت پێغەمبەر (ﷺ) بیگێڕێتەوەو هەر كەسێك لەلای موحەممەد بچێتەوە بۆ لای قورەیش ئەوا نادرێتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ).

## جەنگی خەیبەر لە ( ٧ )ی كۆچی:

پێغەمبەر (ﷺ) بەرێ كەوت بۆ فەتح كردنی قەڵای خەیبەر لەگەڵ (١٤٠٠) هاوەڵ، پاش گەمارۆدانی قەڵاكە توانرا لەسەردەستی عەلی كوری ئەبی تالیب سەركەوتن بەدەست بێننو شەڕەكە تەواو بوو بە كوژرانی زیاتر لە(٩٠) جولەكە و لەموسڵمانانیش كەمتر لە(٢٠) كەس شەهید بوون.

## جەنگی مؤتە لە ( ٨ )ی کۆچی :

پێغەمبەر (ﷺ) سوپایەکی (٣) هەزار کەسی ئامادەکرد بەرەو شام بۆ شەڕکردن لەگەڵ ڕۆمەکان، پێغەمبەر (ﷺ) سێ سەرکردەی یەك لەدوای یەك دانا( زیدی کوڕی حارثة پاشان جعفری کوڕی أبو طالب دواییش عبدالله کوڕی ڕەواحە) و ژمارەی کافرەکان (٢٠٠) هەزار کەس بوو لەموئتە بەیەك گەیشتن و شەڕێکی قورس ڕوویدا لەنێوانیان و هەر سێ سەرکردەکە یەك لەدوای یەك شەهید بوون ئینجا موسڵمانان خالیدی کوڕی وەلیدیان کردە سەرکردەی خۆیان.

لەم جەنگەشدا (١٢) لەموسڵمانان شەهید بوون و لەکافرەکانیش ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا.

## فەتحی مەککە لە( ٨ )ی کۆچی :

کافرەکان پەیماننامەی حودەیبیەیان شکاند بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە خۆ ئامادەکردن بە (١٠) هەزار چەکدارەوە بەڕێ کەوتن بەرەو مەککە تەنها لەقۆلی خالیدی کوڕی وەلید شەڕێکی بچووك دروست بوو ، لەهەموو دەرگاکانی تر موسڵمانان بەسەلامەتی چوونە ناو مەککەو ئازاد کرا ئینجا هەموو بتەکانی کەعبە شکێنران و پاك کرایەوە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) حەفت جار بە دەوری کەعبە سوڕایەوە ئەم ئایەتەی دووبارە دەکردەوە﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا


﴾٨١﴿ الإسراء: ٨١.

**واته**: هەروەها بڵێ: تازە حەق و راستی هاتووەو بەرپابووەو بەتاڵ و ناحەقی پوچ و تەفرو توانابووە بەڕاستی ناهەق و بەتاڵ هەر تیاچووەو جێگیر نەبووەو بەزیووە.

پێغەمبەر (ﷺ) لەمیهرەبانی خۆی لەهەموو خەڵکی مەککە خۆش بوو تەنها چەند کەسانێك نەبێت کە تاوانی زۆر گەورەیان ئەنجام دابوو.

## جەنگی تەبوك لە( ٩ )ی کۆچی:

پاش ئازادکردنی مەککە رۆمەکان ویستیان هێرشی موسڵمانان بەیەکجاری لەناویان ببەن، پێغەمبەر (ﷺ) لەبەرامبەر ئەمەدا سوپایەکی (٣٠) هەزار چەکداری ئامادەکرد بەرەو تەبوك بەڕێ کەوتن و لەوێش (١٨) رۆژمانەوە بەڵام رۆمەکان ترسان نەیان توانی هێرش بکەن و شەڕ رووی نەدا، موسڵمانان بەسەرفرازی گەڕانەوە.

## حەجی ماڵ ئاوایی لە ( ١٠ )ی کۆچی:

لەساڵی (١٠)ی کۆچیدا پێغەمبەر (ﷺ) حەجی ماڵی خوای کرد و (١١٤) هەزار هاوەڵ تێدا بەشداربوو کە پێغەمبەر (ﷺ) تەنها ئەم حەجەی ئەنجام داوە وەلەسەر کێوی عەرەفە (خطبة الوداع) بۆ موسڵمانان دا کە تێدا باسی برایەتی و رەفتار جوانی لەگەڵ ئافرەت و ئەمانەت پاراستن کرد.

لەم کاتەدا ئایەتی ﴿ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾المائدة: ٣ دابەزی.

**واتــە**: جـا ئەمرۆکـە (رۆژی عەرەفەیـە) کـافران نائومێـد بـوون لـەدین‌و ئـایینی ·ئـیتر نـاتوانن زال بەسـەرتانداو هـەرگیز نـوری خوایـان بـۆ ناکوژێتەوە) کەواتە لەوانە مەترسن بەڵکو هەرلـەمن بترسـن ئـەمرۆئایین وبەرنامە کەتانم بەکۆتایی گەیانـدو نـازو نیعمـەتی خـۆم بـۆ تـەواو کـردن رازیم بەوەی کەئیسلام ببێتە بەرنامەو دین‌و ئاینتان.

ئەمەش کۆتا ئایەت بـوو لـەقورئان دا ئـەبوبکر تێگەیـشت خـوای لـێ رازی بێ کە وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) نزیکە.

## کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ)لە (١١)ی کۆچی:

لەکۆتایی مـانگی (صـفر) ١١ کۆچـی هەسـتی بـە ئـازارو نەخۆشـیەکی سەخت کرد لە(١٢) ربیع الاول ئەم ساڵدا لەتەمەنی (٦٣) سـاڵیدا لـەماڵی دایکە عائیشە وەفاتی کرد وەکۆتا ئامۆژگاری پێغەمبەر (ﷺ) ئـەوەبوو ((الصلاة الصلاة اتقوا الله فیما ملکت أیمانکم)) هەر لەشوێنی خۆی نێـژرا هەزاران هەزار صەلات‌و سەلام لەگیانی پاکی بێ..

وصلى الله علیه و علی آله وصحبه أجمعین.

## سەرچاوە

١–روضة الأنوار في سيرة النبـي المختار / صفي الرحمن المباركفوري

٢–گوڵاوی سەرمۆر /وەرگێڕانی : بكر حمه صديق عارف

٣–گەشتێك بە ژیانی پێغەمبەری خودا لە(١٠٠) پرسیارو وەڵامدا/ هێمن عبدالعزيز.

٤–ژیانی پێغەمبەر بۆ منداڵان/نهاد جلال حبيب الله.



## زیکرەکان

### ١-دەست کردن بە نان خواردن:

(بِسم الله )

واتە: بە ناوی خوا

بەڵام ئەگەر لەبیرت چوو ئەوا هەر کاتێ بیرت کەوتەوە بڵێ :

(بسم الله في أولهِ وآخرهِ) صحيح الترمذي.

### ٢-تەواو بوون لەنان خواردن:

((الحمدُ لله الذي أطعَمَني هذا وَرَزَقنيـهِ مِـنْ غَـيرِ حَـولٍ مِنّـي ولا قُـوّة )) صحيح الترمذي /صحيح أبو داود.

واتە: سـوپاس‌و سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی کـە ئـەم خواردنـەی دامـێ ورزق‌و ڕۆزی دام بەبێ هەوڵ‌و توانای خۆم.

### ٣-لەبەرکردنی جل و بەرگ:

((الحمدُ للهِ الذي كَساني هَـذا وَرَزَقِنيـهِ مِـنْ غَـيرِ حَـولٍ مِنّـي ولا قُـوّة)) صحيح أبو داود.

واتـە: سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی کـە ئـەم پۆشـاکەی پۆشـیم و پێـی بەخشیم بەبێ هیچ هەوڵ‌و توانای خۆم.

**٤-جلك لەبەركردنەوە:**

(بِسمِ الله)   صحيح سنن ابن ماجه

واتە: بەناوی خوا.

**٥-چوونە دەرەوە لەماڵدا:**

(بِسمِ الله تَوَكَلْتُ على اللهِ لا حولَ ولا قُوّةَ إلا باللهِ) صححه الالبانی.

واتە: بەناوی خوا پشتم بە خوای گەورە بەستو هیچ هەوڵو توانایەك نیە مەگەر بەخوای گەورەوە.

**٦-لەکاتی پشمین دا:**

*(الحمدُ لله) البخاري.

واتە: سوپاس بۆ خوای گەورە

*وە ئەو کەسەی گوێی لێ بوو دەڵێ: (يَرْحَمُكَ الله)

واتە: خوا رەحمت پێ بکات

*و ئەمیش بابڵێتەوە:

((يَهْدِيكُمُ اللهُ ويُصلِحْ بالَكم)) رواه البخاري

واتە: خوا رێنمایتان بکات و حاڵتان بۆ چاك بکات.

### ٧-نزای دوای دەست نوێژ:

*((أشـهدُ أن لا إلـه إلا الله وحَـدهُ لا شـريكَ لَـهُ وأشْـهَدُ أنّ محمـداً عبـدهُ ورسولُه)) مسلم.

واته: شایەتی دەدەم کە ھیچ پەرستراوێك نیە بە حەق جگە لە(الله) تاکەو بێ ھاوبەشە، وشایەتی دەدەم کە: (محمد) بەندەو نێردراوی خودایە.

*((اللهُمّ اجْعَلْني مِنَ التَوابينَ واجْعَلْني مِنَ المُتَطَهِّرين)) صححه الالبانی.

واته: خوایە بمگێڕی لەتەوبەکارانو بمگێڕی لەخۆپاك کەرەوەکان.

### ٨-چوونە ناو مزگەوت:

بەپێی راستو دەڵێی: ((بِسمِ اللهِ والصلاةُ والسلامُ على رسولِ الله، اللهُمّ افتَحْ لِي أبوابَ رَحْمتِكْ)) مسلم.

واته: بە ناوی خوای گەورەو درودو سڵاو لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، خوایە دەرگاکانی رەحمەتی خۆتم لێ بکەوە.

### ٩-ھاتنە دەرەوە لەمزگەوت:

بەپێی چەپو دەڵێی: (بِسمِ اللهِ والصلاةُ والسلامُ على رسولِ الله ، اللهُمّ إنّي أسْألُكَ مِنَ فَضْلك) صحيح الجامع الصغير

واتە: بە ناوی خوداو درودو سڵاو لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ ، خودایە من داوای فەزڵی خۆتت لێ دەکەم.

## ١٠-دوعای پاش بانگ:

* صەلاوات لێدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ (مسلم).

* پاشان بڵێ ((اللهُمّ رَبَّ هذه الدعوةِ التامَّةِ والصَّلاةِ القائمةِ آتِ محُمداً الوسيلَةَ والفَضْيلَةَ وابْعَثْهُ مَقاماً مَحموداً الذي وَعَدْتَهُ)) البخاري.

واتە: خوایە پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوو نوێژە دامەزراوە ببەخشە بە پێغەمبەرمان محمدﷺ پلەی بەرزی (الوسيلە) وە (الفضيلة) و بیبەرە ئەو شوێنە سوپاس کراوەی کە بەڵێنت پێ داوە؟.

## ١١-چوون بۆ ئاودەست:

(بِسمِ اللهِ، اللهُمَّ إنّي أعوذ بِكَ مِنَ الخُبْثِ والخبائِثِ) بخاري ومسلم والطبراني.

واتە: بەناوی خوا، ئەی خودایە پەنات پێ دەگرم لەشەیتانە نێرو مێیەکان.

## ١٢-هاتنە دەرەوە لەئاودەست:

(غُفْرانَكَ) صححه الالبانی.

واتە: خوایە لێم خۆش بە.

## ١٣- پێش خەوتن:

*خوێندنی (المعوذات) واتە: (قل هو الله احد) و(قل اعوذ برب الفلـق)و (قل اعوذ برب الناس).

دەستی بدات لەیەكو پاشان هەر سێ سورەتی (المعوذات) بخـوێنێو فووی پێدا بكات، دەست بەلەشی دابهێنێو سێ جار دووبارەی بكاتەوە. (البخاري).

*خوێندنی ئایەتی كورسی

شەیتان نزیكت ناكەوێ تا بەیانی (البخاري).

*هەر كەسێ دوو ئایـەتی كۆتـایی سـورەتی البقـرة بخـوێنێ لەشـەودا ئەبێتە پاراستن بۆیو بەسیەتی. (البخاري).

* (باسْمِكَ اللهُمَّ أمُوتُ وأحيا) (البخاري ومسلم)

واتە: بەناوی تۆوە خوایە دەمرمو دەژیم.

## ١٤-هەستان لەخەو:

(الحمدُ للهِ الذي أحيانا بَعْدَ ما أمَاتَنا وإليهِ النّشُور) (البخاري ومسلم).

واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ژیاندینیەوە دوای ئەوەی کە مراندینی (مەبەست خەوتنە) وە زیندوبونەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

## ١٥- زیکرەکانی دوای نوێژە فەرزەکان:

١-وتنی : (أستغفِرُ الله) سێ جار . صحیح مسلم.

واتە: داوای لێخۆشبوون لەخوا دەکەم.

٢- (اللهُمّ أنْتَ السلامُ ومِنْكَ السلامُ تبارْكتَ یا ذا الجلال والاكرام) صحیح مسلم.

واتە: خوایە تۆ سەلامەتیو ئاشتی و سەلامەتیش لەتۆوەیە، پاکیو بێ عەیبی بۆ تۆیە ئەی خاوەنی شکۆو ڕێز.

٣- (لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، اللهُمّ لا مانِعَ لماأعطَيتَ ولا مُعْطِيَ لما مَنَعْتَ ولا يَنْفَعُ ذا الجَدّ مِنْكَ الجَدْ)) البخارى ومسلم.

واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق جگە لە(الله) تاكو بێ هاوبەشە، موڵكو ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێك دا بە توانایە ئەی خوایە هیچ ڕێگرێ نیە بۆ ئەو شتەی تۆ دەیبەخشیو بەخشەر نیە

بـۆ ئـەو شـتەی دەیگریتـەوەو هـیچ خـاوەن پایـەو دەسـەلاتێك دەسەلاتەکەی سوودی نیە بۆی لەرۆژی دواییدا لەسزای تۆ.

٤-خوێندنی (ئایەتی کورسی) لەدوای هەموو نوێژێکی فەرز.

*هـەر کەسـێ لـەدوای هـەموو نوێژێکـەوە بیخوێنێـت هـیچ رێگـری نیـە لەچوونە بەهەشت جگە لەمردن نەبێ. صححه الالبانی.

٥- گوتنی (سبحان الله) ٣٣ جار، (الحمـد لله) ٣٣ جـار، (الله اكـبر) ٣٣ جار ئینجا بڵێ: ((لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير )) كە دەبێتە (١٠٠)ی تەواو.

*هەر کەسێك ئەمە بڵێـت لـەدوای هـەموو نوێـژێکی فـەرز خـوای گـەورە لەگوناهەکانی خۆش دەبێ ئەگەر چی بـە وێنـەی کـەفی دەریـا بێـت) مسلم : ٤١٨/١.

٦-خوێندنی (المعـوذات) واتـە : سـورەتەکانی (قـل هـو الله أحـد) و(قـل أعوذ برب الفلق)و (قل أعوذ برب الناس). صحيح الترمذی.

*بەلام لەپاش نوێژی بەیانیو مەغریب هەر یەکە سێ جار دەیانخوێنی.

## ١٦- زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران

١-خوێندنی ئایەتی (کورسی). صححه الالبانی.

هەر کەسێك بەیانیان ئایەتی کورسی بخوێنێ لەجنۆکە دەپارێزرێ هەتا ئێوارەی لێ دەبێتەوەو هەر کەسە ئێوارە بخوێنێ دەپارێزرێ لێیان تا بەیانی.

٢-خوێندنی سورەتەکانی ( المعوذات ) (الاخلاص، الفلق ، الناس). صحيح الترمذی.

هەر کەسێ بەیانیان و ئێواران سێ جار بیان خوێنێ بەسیەتی لەهەموو شتێك دەپارێزرێ.

٣-وتنی (سبحان الله وبحمده) سەد جار. مسلم.

واتە: تەواو و بێ کەم و کوڕیو سوپاس و ستایش بۆ خوایە.

٤-وتنی (لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير ) صححه الالبانی.

گوتنی دە جار یاخود یەك جار لەکاتی بێ توانایی.

*هەر کەسێك دە جار دوای نوێژی بەیانی بیڵێ ئەوا دە چاکەی بۆ دەنوسرێو دە خراپەی لەسەر لادەچێو دە پلە بەرز دەبێتەوە، بە ئەندازەی رزگارکردنی لەنەوەکانی ئیسماعیل پێغەمبەر عليه السلام چاکەی دەکاتو ئێوارانیش بیڵێ هەروەها دەبێتە پارێزەرێك بۆی لەشەیتان تاکو رۆژی لێ دەبێتەوە.

٥-ووتنی (أعوذُ بكلِماتِ الله التّاماتِ من شَرِّ ما خَلَقْ) صحيح الترمذی.

پەنائـەگرم بـە ووشــە تـەواوەكانی خـوای گـەورە لەخراپـەی دروسـت كراوەكان

*هەر كەسێ ئێواران سێ جاربیڵێ ئەوا ئـەو شـەوە پێـوەدان زیـانی پـێ ناگەیەنێ.

٦-ووتنی (بِسْمِ اللهِ الّذي لا يَضُرّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ في الأرْضِ ولا في السّمَاءِ وَهُوَ السّمِيعُ العَلِيمُ، ثَلاَثَ مَرّاتٍ إلّا لم يضُرّهُ شَيْءٌ). صححة الترمذي.

واتە: بەناوی ئەو خودایە كە لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێك زیان ناگـەینێ نە لەزەوی نە لەئاسماندا ئەو خوایە بیسەرو زانایە.

٧- (رضيت بالله رباً ، وبالإسـلام دينـاً ، وبمحمـد صـلى الله عليـه وسـلم نبياً).

واتە: رازیم بە (الله) كە پەروەردگارم بێو ئیسلام دینو بەرنامەم بێـت و موحەمەدیش ﷺ پێغەمبەرو پێشەوام بێت.

*چـونكە پێغەمبـەر دەفـەرموێ هـەر كەسـێك ئـەم زیكـرە بخـوێنێ مـن كەفیل و گرێنتی دەدەمێ كە دەسـتی بگـرم تـا دەیبەمـە بەهەشـت. السلسله الصحيحه.

٨- وتنی (دە صەڵاوات) چونكە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هەر كەسێك كـاتی بـەیانی بەسـەر دادێـت (دە جـار) سـڵاواتم لەسـەر لێبـدات شەفاعەتی منی بەردەكەوێ لەرۆژی دواییدا.

٩-(سبحان اللهش وبِحَمْدِهِ ، عَدَدَ خَلقِهِ، ورضا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدادَ كلماتِهِ) تەنها بەیانیان (٣) سێ جار . مسلم.

**واتە:** پاکیو بێ کەمو کورتی ، گەورەییو سوپاس بۆ خوای گەورە بە ئەنــدازەی ژمــارەی دروســت کراوەکــانی ورەزامەنــدی خــۆی، قورساییو سەنگینی عەرشەکەی و زۆرو درێژی ووشەکانی.

*هەروەکو لەفەرمودەی (مسلم) دا هاتووە: ((...پێغەمبەرﷺ لەپاش رۆژهەڵات گەڕایەوە بینی دایکە جویریە (خودا لێ رازیبێت) هەر لەوشوێنەی مزگەوت دانیشتبوو کە لەنوێژی بەیانیەوە خەریکی زیکر بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : من ئەو چوار وشەم گوتیە بە قەد هەموو زیکرەکانی تۆیە.

١٠ – ((اللهُمَّ أنْتَ ربِّي لا إلهُ إلاأنْتَ خَلَقْتَني وأنا عَبْدُكَ وأناعلى عَهْدكَ وَوَعْدكَ مااستَطَعْتُ،اعوذُ بكَ منْ شَرِّ ما صَنَعْتُ،أبوُءُ لَكَ بنِعْمَتِك عَليَّ وأبوُءُ لَكَ بِذَنْبي فَاغفرْ لي فإنَّهُ لايَغْفرِ الذُنُوبَ إلا أنت". ))

واتە: خوایە تۆ پەروەردگارمی هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق جگە لەتۆ بەدیتهێناوم و من بەندەی تۆم و من لەسەر پەیمان و بەلێنەکەممم کە بە تۆم داوە تابتوانم پەنات پێ دەگرم لەخراپەی ئەوەی ئەنجامم داوە لەگوناه دان ئەنێم بە نیعمەتەکانتدا و دان ئەنێم بە گوناهەکانمدا. سا خوایە لێم خۆش بە ، بەراستی کەس لەگوناه خۆش نابێ جگە لەتۆ.

*هەر کەسێ ئێوارە بە یەقینەوە بڵێ و شەو بمرێ دەچێتە بەهەشتەوە، هەر کەسێ بەیانی بەیەقینەوە بیڵێ و ئەو رۆژە بمرێ دەچێتە بەهەشتەوە. ( أخرجه البخاري).

تێبینی: بۆ زیاتر فێربونی وێردو زیکرەکان بگەرێوە پەڕاوە بەسودەکەی قەڵای بروادار – حمزە بەرزنجی–

# فەرمووده شیرینەکان

١–پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (( إن الله طَيِّبٌ لا يَقْبَلُ إلا طَيِّباً)) الالباني: هذا الحديث حسن..

**واته:** بەراستی خودای گەورە پاكو بێ گەردە، شتی پاكو بێ گەرد نەبێ وەری ناگرێ.

٢– پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((فإذا نَهَيْتُكُم عَنْ شَيْءٍ فاجْتَنِبُوهُ، وإذا أمَرْتُكُم بأمرٍ فَأْتُوا منهُ ما اسْتَطَعتُم)) متفق عليه.

**واته:** ئەگەر قەدەغەی شتێکم لێ کردن ئەوە وازی لێبێنن وە ئەگەر فەرمانی شتێکیشم پێکردن ئەوە بە پێی توانای خۆتان جێ بەجێی بکەن.

٣– پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((لا يُؤْمِنُ أحَدُكُمْ حتّى يُحِبَّ لأخيهِ ما يُحِبُّ لِنفسهِ)) متفق عليه.

**واته:** هیچ کەس لەئێوە بڕوای تەواو نابێ تاوەکو ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆش بێت، دەبێ بۆ براکەشی ئەوا پێی خۆش بێت.

٤– پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((يَسِّروا ولا تُعَسِّروا ، بَشِّروا ولا تُنَفِّروا)) (متفق عليه).

**واتە**: كار ئاسان بكەن و كار گران مەكەن، مژدەی خۆشی بە خەڵك بدەن، و بەهەڕەشە و گوڕەشەی زۆر خەڵك لەدین هەڵمەگێڕنەوە.

٥- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((أحَبُّ البِلادِ إلى اللهِ مَساجِدُها، وأبغَضُ البِلادِ إلى اللهِ أسواقُها)) الالباني: هذا الحديث صحيح.

**واتە**: خۆشترین شوێن و جێگا لەشارەكان لەلای خوای گەورە مزگەوتەكانیەتی، وەبێزارترین شوێن وجێگا لەشارەكان لەلای خوای گەورە بازاڕەكانیەتی.

٦- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((مَنْ قالَ مثلَ ما قال هذا يَقيناً دَخَلَ الجَنةَّ)) الالباني: هذا الحديث صحيح.

**واتە**: هەر كەسێك وەكو ئەو بانگبێژە بڵێ (وەلام دانەوەی بانگ) بێ گومان شایستەی ئەوە دەبێت بچێتە بەهەشت.

٧- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((مَن سَتَرَ مُسلَماً سَتَرَهُ اللهُ في الدنيا والآخرة) مسلم وبخاری.

**واتە**: هەر كەسێك عەیبی موسڵمانێك داپۆشێ، خوای گەورە لەدونیاو ئاخیرەت عەیبی دادەپۆشێ)).

٨- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((ما زال جِبْريلُ يُوصيني بِالجارِ حتّى ظننْتُ أنَّهُ سَيُورِّثُهُ)) متفق عليه.

**واتـــه**: بـەردەوام جبرائیـل وەسـیەتم پێـدەکات بـە چـاکەکردن لەگـەڵ دراوسێ تەنانەت گومانم دەبرد کەوا بیکاتە میرات بـەر (مەبەسـتی دراوسێ ببێتە میرات بەری دراوسێکەی).

٩- پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: ((سِبابُ المُسلِمِ فُسُوقٌ ، وقِتالُهُ كُفْرٌ)) متفق علیه.

**واته**: جنێو دان بـە کەسـی موسـڵمان توشـی فاسـیقی دەبێـت (فاسـقی بـچووك) شـەڕکردن لەگـەڵ موسـڵمان توشـی بـێ بـاوەڕی دەبێـت (کوفری بچوك).

١٠- پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: ((مَنْ يُحْرَمِ الرِّفْقُ يُحْـرَمِ الخَيْرَ)) مسلم.

**واته**: هەر کەسێ لەنەرم و نیانی بـێ بـەش بـوو، ئـەوا لەهـەموو چـاکەو خێرێك بێ بەش دەبێت.

١١- پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: ((إعْلَمْ أنَّكَ لَن تـسجُدُ لله سَجْدَةَ إلا رَفَعَ اللهُ لك بِها درجَةً وحَطَ عَنْـكَ بِهـا خطيئَـةً)). الالبـاني: هذا الحديث صحيح.

**واته**: بزانە، هەر سوجدەیەك کە تـۆ بـۆ خـوای دەبـەیت، خـوای گـەورە پلەیـــەکت بـــۆ پـــێ بەرزدەکاتـــەوەو گونـــاهێکیش بـــۆ پـــێ هەڵدەوەرێنێت.

**١٢-** پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((ركعتا الفجر خيرٌ لك من الدنيا وما فيها)) رواه مسلم.

**واتە**: دوو ركعەتى (سوننەتى پێش) نوێژى بەيانى خێرى لەدونياوئەوەى كە تێيدايە چاكترو زياترە.

**١٣-** پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((إزْهَدْ في الدنيا يُحِبَّكَ الله وازْهَدْ فِيما في أيدي الناسِ يُحِبَّكَ الناسُ) الالباني: هذا الحديث صحيح.

**واتە**: واز لەدونيا بێنە، خواى گەورە خۆشى ئەوێى، واز لەو شتانە بێنە كەلەبەر دەستى خەڵك دايە خەڵك تۆيان خۆش دەوێت.

**١٤-** پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((المُسْلِمُ مَن سَلِمَ المُسْلِمونَ من لِسانِهِ ويَدِهِ، والمُهاجِرُ مَنْ هَجَرَ ما نهى الله عَنْهُ)) متفق عليه.

**واتە**: موسڵمان ئەو كەسەيە كە موسڵمانان لەزمانىو دەستى پارێزراو بێت وە كۆچەريش ئە كەسەيە كە واز لەو شتانە دێنێت كە خواى گەورە قەدەغەى كردووە.

**١٥-** پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((آيَةُ المُنافِقِ ثلاثٌ: إذا حَدَّث كَذَبَ، وإذا وَعَدَ أَخْلَفَ، وإذا اؤْتُمِنَ خانَ)) متفق عليه.

**واتــە**: نیـشانەکانی دووڕووەکـان سـێن: هـەر کاتێـك قـسە بکـات و درۆ دەکات، وە هـەر کاتێـك بـەڵێن بـدات دەیـشکێنێ، وە هـەر کاتێـك شتێکی بە ئەمانەت لای بێ خیانەتی لێدەکات.

**١٦-** پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: ((مَنْ تَـشَبَّهَ بِقَـوْمٍ فَهُـوَ مِنْهُمْ) الالباني: هذا الحديث صحيح.

**واتە**: هەر کەسێك خۆی بە هەر کۆمەڵێك بچوێنێت ئـەوا لـەم کۆمەڵەیـە دەبێت.

**١٧-** پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: ((إنَّ الله يقُـولُ، يـا ابـنَ آدم اكفِني أوَّلَ النهار بأربَعَ ركعاتٍ أكفكَ بِهِنَّ آخرُ يومِكَ)) الالبـاني: هذا الحديث صحيح.

**واتە**: خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی بەنی ئادەم لەسەرەتای رۆژدا چوار رکعـەت نوێـژم بـۆ تـەرخان بکـە، ئـیتر هـەتا کۆتـایی ئـەو رۆژە دەتپارێزم پێیان، (مەبەستی نوێژە- ضحی)یە.

**١٨-** پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: ((أيّما امـرأةٍ اسـتعطَرَتْ فَمَرَّتْ بقومٍ ليجدُوا رِيحَها فِهيَ زانية) الالباني: هذا الحديث صحيح.

**واتە**: هەر ئافرەتێك خۆی بۆندار بکات و بەلای کۆمەڵـە پیاوێکـدا بـڕوات تا بۆنی بکەن ئەوا ئەو ئافرەتە زینای کردووە.

**١٩**- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((المُسْلِمُ أخـو المُسْلِمِ، لا يَظْلِمُهُ، ولا يُسْلِمُهُ، ومَنْ كان في حاجةِ أخيهِ، كانَ اللهُ في حاجَتِه). متفق عليه.

**واتــه**: موسـڵمان بـرای موسـڵمانه، سـتەمی لێناكـات، نایداتـه دەسـتی دوژمنانەوه، هەر كەسێك بڕواته دەم پێویستی برایەكیەوه، خـوای گەورە دێته دەم پێویستیەكانیەوه.

**٢٠**- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفـەرموێ: ((مَـنْ كـان يُـؤمِنُ بـالله واليوم الآخرِ فلْيَقُل خَيْراً أو لِيَصْمُتْ) متفق عليه.

**واته**: هەر كەسێك باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی خێـرو چاكە بكات یاخود بێ دەنگ بێت.

**٢١**- پێغەمبـەر صـلى الله عليـه وسـلم دەفـەرموێ: ((إيّـاكُمْ والظّـنّ فـإنّ الظّنَّ أكذبُ الحديث)) متفق عليه.

**واته**: خۆتان بپارێزن لەبەد گومانی چونكە بەدگومانی درۆی قسەكردنە.

**٢٢**- پێغەمبـەر صـلى الله عليـه وسـلم دەفـەرموێ: ((إنَّ النّـاسَ إذا رَأوُا المُنكَـرَ ولم يُغَيّـروهُ أوشَـكَ أن يَعُمَّهُـمُ اللهُ بِعِقابِـه)) الالبـاني: هـذا الحديث صحيح..

**واته**: ئەگەر خەڵكی گوناهو تاوان و خراپـەكاريان بـينیو نـەيان گـۆڕی، ئەوا نزیكە خوای گەورە سزای خۆی بەسەر هەموویاندا ببارێنێت.

٢٣- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((أَتَدْرُونَ مَا الْغِيبَةُ؟" قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ" قِيلَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: إِن كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ، فَقَدِ اغْتَبْتَهُ. وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ، فَقَدْ بَهَتَّهُ)) مسلم.

**واتە**: ئایە دەزانن غەیبەت چیە؟ وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ئەوەیە باسی برای موسڵمانت بکەی بە شتێك کە ئەو خۆی حەزی لێ نەکات، وترا: ئەی ئەگەر ئەو شتەی باسی دەکەم لەبراکەم هەبوو؟ فەرمووی: ئەگەر ئەوەی تێدابوو ئەوە غەیبەتە، بەڵام ئەگەر ئەوەی باستکرد تێدا نەبوو ئەوە دەبێتە بوختان.

٢٤- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (( لا يَدْخُلُ الجنَّةَ مَنَّانٌ، ولا عاقٌ، ولا مُدْمِنُ خَمْرٍ)) الالباني: هذا الحديث صحيح..

**واتە**: ناچێتە بەهەشت ئەوەی منەت بەسەر خەڵکیدا بکات و ئەوەی دڵی دایكو باوکی بڕەنجێنێ، وە ئەوەی بەردەوام بێ لەسەر مەی خواردنەوە.

٢٥- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((لَعَنَ اللهُ الرَّجُلَ يَلْبَسُ لِبْسَةَ المرأةِ، والمرأةُ تَلبِسُ لِبسةَ الرَّجُلِ) الالباني: هذا الحديث صحيح.

**واتە**: خوا نەفرەتی لەو پیاوە کردووە کە بەرگی ئافرەت لەبەر دەکات، وە ئەو ئافرەتەی کە بەرگی پیاو لەبەر دەکات.



٢٦- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((يا غُلامُ سَمِّ اللهَ وكُلْ بِيَمينِكَ وكُلْ مِمَّا يليك) متفق عليه.

**واتە**: بسم الله بکەو ئینجا بە دەستی راست بخۆو لەلای خۆت بخۆ (لەپێش خۆت بخۆ).

٢٧- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((مَنْ يَضْمَنْ لي ما بَيْنَ لَحْيَيْهِ وما بين رِجْلَيْهِ أَضْمَنْ لَهُ الجَنَّةَ) بخاري.

**واتە**: هەر کەسێك گەرەنتی نێوان ریشیو نێوان هەردوو پێیم بۆ بکات( مەبەست زمان و عەورەتە) ئەوا منیش گەرەنتی بەهەشتی بۆ دەکەم.

٢٨- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: (( لَيْسَ شيءٌ أكْرَمَ على الله سُبْحانَهُ مِنَ الدُّعاء) الالباني: هذا الحديث حسن.

واتە: هیچ شتێ نیە ئەوەندەی دوعاو پاڕانەوە لای خوا بەرێز بێت.

٢٩- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((لَعَنَ اللهُ الواشماتِ والمُستَوشِماتِ والنامِصاتِ والمُتَنَمِّصاتِ) متفق عليه.

**واتە**:خوا نەفرەتی کردووە لەوانەی کە خاڵ دەکوتنو لەوانەش کە خاڵیان بۆ دەکرێت، وەلەوانەش کە مو هەڵکێشی دەم و چاوو برۆن و لەوانەش کە بۆیان هەڵدەکێشرێت.

**٣٠-** پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (( (المرءُ علی دینِ خلیلِه) الالباني: هذا الحديث حسن .

**واتە**: مرۆڤ لەسەر دینی خۆشەویستەكەیەتی.

**٣١-** پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: ((لَيْسَ الشَّديدُ بالصُّرعَةِ إنّما الشَّديدُ الذي يَملِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الغضبِ)) متفق عليه.

**واتە**: كەسی پاڵەوان و بە توانا بە زۆرانبازی نیە، بەڵكو كەسی پاڵەوان و بە توانا ئەو كەسەیە كە لەكاتی توڕەبوندا خۆی دەگرێ

**٣٢-** پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: ((مَثَلُ البَيْتِ الذي يُذْكَرُ الله فيه والبيت الذي لا يُذكر الله فيه، مَثَل الحي والميت)) صحيح الجامع للالباني.

**واتە**: نمونەی ئەوماڵەی زیكری خودای تێدا دەكرێت و ئەو ماڵەیش كە زیكری خوای تێدا ناكرێت وەكو زیندوو مردوو وایە.

**٣٣-** پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: (( سَيكونُ في آخِرِ أُمَّتي كاسياتٌ عارياتٌ على رؤوسهن كَأَسْنِمَةِ البُخْتِ، العنوهن فإنهُنَّ ملعونات)) الالباني: هذا الحديث حسن.

**واتە**: لەكۆتایی ئوممەتم ئافرەتانێك پەیدا دەبن كە پۆشتەو پۆشاكیان لەبەرە بەڵام لەراستی دا رووتن، وەك كۆپاڵی حوشتر قژیان لەسەر

سەریان تۆپەڵە دەکەن، جا ئێوە نەفرەتیان لێ بکەن چونکە ئەوان نەفرەت لێ کراون.

**٣٤-** پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((رَحِمَ اللهُ رجُلاً سَمْحاً إذا باع، وإذا اشترى، وإذا اقتضى) بخاري.

**واتە**: خوای گەورە بەزەیی بەکەسێکدا دێتەوە بەخشندەو ئاسانکارە لەکاتی فرۆشتن ولەکاتی کڕین و لەکاتی وەرگرتنەوەی قەرزو مافی خۆی.

**٣٥-** پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((إنّ مَنْ قَرأَ سورةَ الكهف يوم الجُمُعَةِ أضاءَ لهُ من النور ما بين الجُمُعَتَيْنِ) الالباني: هذا الحديث صحيح.

# پوختەی فیقهی شەریعەت

## كتابی پاكو خاوێنی
## (كتاب الطهارة)

**پاكی** : بریتیە لەلابردنی پیسیو بێ دەست نوێژی گەورەو بچوك بە ئاو یان بە خۆڵ.

**حوكمی:** واجیبە بە مەرجێك لەبیربونو توانای لابردنی هەبێت.

### جۆرەكانی پاك كردنەوە:

أ-پاككردنەوە لەپیسی وەك (میز، پیسایی، خوێنی حەیز،...).

ب-پاك كردنەوە لەبێ دەست نوێژی گەورە (غوسل)، بێ دەست نوێژی بچوك (دەست نوێژ).

### جۆرەكان ئاو:

١-ئاوی رەها (المطلق): وەكو ئاوی بەفروباران‌و تەزرەو رووبارو دەریاو بیرو كانی‌و كارێز، لەگەڵ ئەو ئاوەی بە زۆر مانەوە رەنگی دەگۆڕێت، ئەمانە هەمویان پاكن‌و پاك كەرەوەشن.

٢-ئاوی بە كارهاتوو ، پاكو پاك كەرەوەیە ئەگەر تام یان بۆن یان رەنگی نەگۆڕابوو.

٣-ئەو ئاوەی شتی پاکی تێکەڵ بوو بێ، وەکو (سابون، ئارد، زەعفەران،...) ئەوا:-

أ-ئەگەر تام یان بۆن یان رەنگی نەگۆڕابوو ئەوا پاكو پاك كەرەوەیە.

ب-ئەگەر یەکێکی گۆڕابوو ئەوا پاکە بەڵام پاك كەرەوە نییە.

٤-ئەو ئاوەی پیسی تێکەڵ بوو بێت ئەوا:

أ-ئەگەر تام یان بۆن یان رەنگی نەگۆڕابوو ئەوا پاكو پاك كەرەوەیە.

ب-ئەگەر یەکێکی گۆڕابوو ئەوا بە تەواوی پیسە.

## جۆرەکانی پیسی:

١-میزی ئادەمیزاد.

٢-پیسایی ئادەمیزاد.

٣-مەزیو وەدیو پاش میزە، بەڵام مەنی پاکە.

٤-لیکی سەگ.

٥-مردارەوەبوو تەنها (مردووی ئادەمیزاد، ماسی، کللۆ).

٦-میزو تەرسی ئەو ئاژەڵانەی کە گۆشتیان ناخۆرێ، بەڵام ئەوانەی گۆشتیان دەخورێ میزو تەرسیان هەندێك لەزانایان دەفەرموون پاکە.

٧-خوێن، زانایان تێدا راجیاوازن بەڵام یەك دەنگن لەسەر ئەوەی خوێن حەیزو نیفاس پیسن.

٨-گۆشتی بەراز.

٩-ئەو ئاژەڵانەی کە پیسی دەخۆن.

١٠-عارەق بە لای جەماوەری زانایان پیسە.

## پاك كردنەوەی پیس بووەكان:

١-پاككردنـەوەی جلـك لـەمیزی منـداڵ، ئاوپرژانـدن لەسـەر جلـك بـۆ کوڕی شیرەخۆرو شوشتنی بۆ کچی شیرە خۆر.

٢-پاككردنەوە لەمەزی، شوشتنی عەورەتو شـوێنە پـیس بووەكـەی سەرجلك.

٣- پیستەی مرداربوو، بە غاراندن(الدبغ) پاك دەبێتەوە.

٤-خوێنی حەیز بەشۆردنی ئەگەر رەنگیشی مایەوە قەیدیناكە.

٥-پاككردنـەوەی زەوی بـە ئـاو یـان بـە وشـك بوونـەوە كـە هـیچ ئاسەواری پیسیەكە نەمێنێ.

٦-پیسی ژێر پێڵاوو نەعل، بەخشاندنی بەزەویدا پاك دەبێتەوە.

٧-پـاك كردنـەوەی كۆتـایی جلكـی ئـافرەت كـە لـەزەوی دەخشێ، خشاندنی بە زەویدا پاش پیس بوونی پاك دەبێتەوە.

٨-پاك كردنەوەی قاپ كە سەگ دەمی تێنـاوە، ئـەویش حـەوت جـار دەشۆرێ لایەنی كەم دەبێت جارێك بە قوڕە سۆر بێت.

## تارەت گرتن:

تارەت گرتن واجیبە لەمیزو پیسایی.

خۆ پاك کردنەوە بە ئاوە، دروستیشە بە هەر شتێکی تر کە پیسی لابدات وەکو (بەرد، دار، کاغەز، کلێنس...).

هەندێ شت خۆ پێ پاککردنەوەیان دروست نیە وەکو (قشپل وریخ‌و ئێسقان‌و هەموو خواردنێك یان هەر شتێك حورمەت‌و رێزی خۆی هەبێ یان وشەی پیرۆزی لەسەر نوسرابێت).

## ئادابەکانی تارەت گرتن:

١–حەرامە پیسایی کردن لەسەر رێگاو سێبەری خەڵك و ژێردارێکی بەردار.

٢–حەرامە پیسایی ومیزکردنە کردنە ئاوی راوەستاو.

٣–حەرامە روکردن‌و پشت کردنە قیبلە لەدەرودەشت بەڵام لەناو خانوودا دروستە.

٤–دوعای چوونە سەر ئاوو هاتنە دەرەوە بخوێنێ.

٥–بەپێی چەپ چوونە ژووری‌و بەپێی راست هاتنە دەرێ.

٦–سونەتە دوورکەوتنەوە یان خۆ وون کردن لەکاتی تارەت کردن.

٧–نابێت بە دەستی راست خۆی پاك بکاتەوە.

٨–نابێت شتە پیرۆزەکان بباتە ژوورێ.

٩–پێویستە خۆی بپارێزێ لەپشکی میز.

١٠-دووركەوتنەوە لەقسەكردن مەگەر پێویست بێ.

١١-ئەگەر بەبەرد خۆی پاك كردەوە سونەتە لەسێ بەرد كەمتر نەبێ.

## سروشتە پاكەكان:

**(سنن الفطرة):**

١-كورت كردنەوەی سمێڵ.

٢-هێشتنەوەی ریش.

٣-سیواك بەكارهێنان .

٤-ئاو لەدەم و لوت وەردان.

٥-نینۆك كردن.

٦-شۆردنی كەلێنی پەنجەكان و گوێ.

٧- هەڵكەندنی موی بن باڵ.

٨-بەرتاشین.

٩-تارەت گرتن.

١٠-سوننەت كردن.



# دەست نوێژ

## پایەکان

١-نیەت.

٢-ئاو لەدەم و لوت وەردان.

٣-شوشتنی دەم وچاو.

٤-شوشتنی دەست لەگەڵ ئەنیشك.

٥-مەسح کردنی سەر پاشان گوێکان.

٦-شوشتنی هەردوو پێ یەکان لەگەڵ گۆزینگ.

## سونەتەکانی دەست نوێژ:

١-بسم الله کردن لەسەرەتا.

٢-سیواك بەکارهێنان.

٣-شوشتنی هەردوو دەست لەسەرەتا.

٤-سێ جار شوشتنی هەموو ئەندامەکان جگە لەمەسحی سەر کە یەك جارە.

٥-شوشتنی راستە پێش چەپە.

٦-شوشتنی کەلێنی پەنجەکان.

٧-زیادەڕۆی نەکردن لەئاو بەکارهێنان.

٨-خوێندنی دوعا دوای دەست نوێژو کردنی دوو رکعاتی نوێژی دەست نوێژ.

## ئەو شتانەی کە دەست نوێژ هەڵدەوەشێننەوە:

١–هەر شتێك لەپێش و پاشی مرۆڤ دەربچێت.

٢–خەوتن بە پاڵ دانەوە.

٣–خواردنی گۆشتی حوشتر.

٤–لەهۆش چوون.

٥–دەستدانی عەورەتی پێشەوە بە ئارەزوو.

## ئەو عیبادەتانەی پێویستیان بە دەست نوێژە:

١–نوێژ.

٢–سوڕانەوە بە دەوری کەعبە.

# خۆشوشتن (الغسل)

واتە: گەیاندنی ئاو بە هەموو لەش لەگەڵ نیەت بە مەبەستی پاك بونەوە.

## ئەوانەی شوشتن واجب دەکەن:

## (موجبات الغسل):

١-موسڵمان بوون.

٢-هاتنە خوارەوەی مەنی.

٣-گەیشتنی ئەندامی نێرینە بە ئەندامی مێ ینە.

٤-مردن.

٥-وەستانی خوێنی حەیزو زەیسانی.

## شوشتنە سونەتەکان

١-پێش نوێژی هەینی.

٢-پێش نوێژی جەژن.

٣-پێش ئیحرام بەستن بۆ حەج و عومرەو چونە ناو مەککە.

٤-پێش دووبارەکردنەوەی جیماع.

٥-پاش شوشتنی مردوو.

٦-پاش بە ئاگاهاتنەوە لەبێ هۆشی.

٧-پاش دەفن کردنی موشریك.

٨-ئافرەتی خوێنە چرکە (المستحاضة) بۆ هەموو نوێژێك.

## تەیەموم: چۆنیەتی تەیەموم:

هەردوو دەستی لەزەوی دەدات پاشان فوی لێدەکاتو ئینجا مەسحی دەمو چاوو دەستی پێدەکات.

ئەوەی بە دەست نوێژو خۆشوشتن حەلال دەبێت بە تەیەمومیش حەڵاڵ دەبێت، بۆ کەسێك کە ئاوی دەست نەکەوێت، یا ترسیَ ئەوەی هەبێت ئاو زیانی پێبگەیەنێ.

هەڵدەوەشێتەوە بەوانەی کە دەست نوێژی پێ هەڵدەوەشێتەوە.

## مەسح کردن لەسەر خوف

دەتوانرێ لەجیاتی پێ شوشتن مەسح بکرێت لەسەر خوفو گۆرییە، بەمەرجێك بە دەست نوێژەوە لەپێ کرابێت، دەست هێنان بەسەری دا ماوەی شەو رۆژێك بۆ نیشتەجیَو سێ شەوو سێ رۆژ بۆ گەشتیار، بەتاڵ دەبێتەوە بە تەواو بوونی ماوەی دیاری کراو یان لەش گرانی، یان داکەندنی ئەوەی مەسحی لەسەر کراوە، یان ئەوانەی کە دەست نوێژ هەڵدەوەشێننەوە.



# حەیرز و زەیسانی و خوێنە چرکە

لەشوێنی منداڵ بوونی ئافرەتەوە ئەو خوێنانە دێتە دەرێ

حەیز: ئەو خوێنە رەشەو بۆن ناخۆشەیە لەسوری مانگانەی ئافرەت دایە.

زەیسانی: ئەو خوێنەیە کە پاش منداڵ بوون دێت.

خوێنە چرکە: ئەو خوێنە سورەیە کە بە هۆی نەخۆشی یەوە (پچڕانی دەمار) جگە لەکاتی حەیزو زەیسانی دێت.

**ئەوەی لەسەر حەیزو زەیسانی حەرامن**

١-نوێژو رۆژو گرتن، بەڵام رۆژووەکان دەگێرێتەوە.

٢-سوڕانەوە بە دەوری کەعبە.

٣-جووت بوون.

ئەوەی بۆ حەیزو زەیسانی حەرامە بۆ ئافرەتی خوێنە چرکە (الاستحاضة) حەلالن، بەڵام بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژ دەشواتەوە.

# کتابی نوێژ(الصلاة)

نوێژ: خواپەرستی یەکە بە وتەو کردار، لەچەند کاتێکی دیاری کراو، کە بە تەکبیرە دەست پێدەکات و بەسەلام دانەوە کۆتایی دێت.

## مەرجەکانی نوێژ:

١-موسڵمان بێت.
٢-ژیر بێت (عاقل).
٣-پیّ گەیشتو بێت (بالغ).
٤-داپۆشینی عەورەت.
٥-رووکردنە قیبلە.
٦-نوێژەکە کاتی هاتبێت.
٧-هەبوونی دەست نوێژ، غوسلیشی لەسەر نەبێت.
٨-پاکی جەستەو جلك و شوێنی نوێژ.
٩-نیەت.

## پایەکانی نوێژ:

١-بەپێوە وەستان ئەگەر توانای هەبوو بۆ فەرزەکان.
٢-الله اكبر ی نوێژ بەستان.
٣-خوێندنی سورەتی الفاتحة لەهەموو رکاعەتێك.
٤-چەمانەوەو ئارامی تێیدا (الركوع والطمأنينة فيه).
٥-راست بوونەوە لەچەمانەوەو ئارامی تێیدا.
٦-کرنوش بردن و ئارامی تێیدا.
٧-دانیشتنی نێوان دوو کڕنوشەکە.

٨-شایەدومانی کۆتایی (التحیات).

٩-سەلام دانەوەی لای راست.

١٠-رێزبەندی نێوان پایەکان.

## واجیباتی نوێژ:

١-الله اكبرى نێوان روكنەكان.

٢-گوتنی (سُبحانَ ربِّيَ العظيم) لەچەمانەوەدا.

٣-وتنی (سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ، ربَّنا ولَكَ الحَمْد) لەراست بوونەوە دوای چەمانەوە.

٤- وتنی (سُبحَانَ رَبِّيَ الأعلى) لەكرنۆشدا.

٥-شایەدومانی یەكەم (التحیات).

٦- خشوع لەناونوێژدا.

*تـەنها شـایەدومانی یەكـەم سـوجدەی سـەهووی دەوێ لـەكاتی لەبیركردن و نەخوێندنی.

## سوننەتەكانی نوێژ

١-دانانی سوترە.

٢-دەست بەرزکردنەوە لەگەڵ الله أكبر لەم شوێنانەدا (دەست پێکردن، راست بوونەوە لەچەمانەوە، هەڵسانەوە لەپاش تەحیاتی یەکەم).

٣-دانانی دەستی راست لەسەر دەستی چەپ.

٤-خوێندنی دوعای دەست پێکردنی نوێژ(دعاء الاستفتاح).

٥-گوتنی أعوذ بالله من الشيطان الرجيم.

٦-گوتنی (ئامین) پاش فاتیحە.

٧-خوێندنی قورئان پاش فاتیحە.

٨-ئاماژەکردن بە پەنجە لەتەحیات.

٩-سەیرکردنی جێگای کڕنۆش لەهەموو نوێژەکەدا.

١٠-خوێندنی دوعا پاش تەحیات.

١١-سەلام دانەوەی دووەم.

١٢-خوێندنی زیکرەکانی پاش نوێژ.

## مەکروهاتی ناو نوێژ:

١-چاو بەرزکردنەوە بۆ ئاسمان و سەیرکردنی شتێك کە سەرقاڵت بکات لەنوێژ.

٢-ئاوڕدانەوە لەنوێژ بەبێ هۆ.

٣-دەم داپۆشین (السدل).

٤-نوێژكردن لەكاتی ئامادەبوونی خواردن یان تەنگاو بێت.

٥-هەردوو پێ چەقاندن یا راخستن لەكاتی تەحیات.

٦-خوێندنی قورئان لەچەمانەوەو كڕنۆشدا.

٧-راخستنی هەردوو باسكی لەكاتی كڕنۆشدا.

٨- تف كردنە بەردەمی یان لای راستی.

٩-چاو نوقاندن و پەنجە تەقاندن و پالتۆ - چاكەت - خستنە سەر شان.

١٠-پێش ئیمام كەوتن.

١١-نوێژكردن لەمۆلگەی حوشتر - تەویلە -و خاكی زەوت كراوو گەرماوو، قەبرستان.

## ئەوانەی نوێژ بەتاڵ دەكەنەوە

١-خواردن و خواردنەوە.

٢-قسەكردن بە ئەنقەست.

٣-بەجێهێشتنی مەرجێك یان پایەكی نوێژ بەبێ عوزر.

٤-دڵنیا بوون لەدەست نوێژ شكان.

٥-دەركەوتنی عەورەت ئەگەر یەكسەر داینەپۆشی.

٦-پێکەنینی بە دەنگ.

ئەگەر کەسێك لەبەر تەمبەڵی نەیکا باوەڕیشی پێ نەبێ ئەوا کافر دەبێ، بەڵام ئەگەر لەبەر تەمبەڵی نەیکاو باوەڕیشی پێ هەبێت ئەوا کاربەدەستی موسڵمانان داوای تەوبەی لێدەکات ئەگەر نەیکرد دەبێ بکوژرێت ولەقەبرستانی موسڵمانان نابێ بنێژرێت.

منداڵ بۆ ڕاهێنان لەحەوتساڵی فرمانی پێ دەکرێ لەدەساڵی لێی دەدرێت لەسەر نوێژ نەکردن.

کەسێك خەوی لێکەوت یان بیری چوو کەی لەخەو هەڵسا یا بیری کەوتەوە ئەو کاتە نوێژەکەی دەکات.

ئەگەر کەسێك بە ئەنقەست نوێژێکی نەکرد تا کاتەکەی بەسەر چوو، هیچ نوێژێك جێی ناگرێتەوەو دەبێت تەوبەی لەسەر بکات.

## سێ کات نوێژی سونەتی بێ ناو ( مطلق )ی تێدا قەدەغەکراوە:

١-دوای نوێژی بەیانی تا ڕۆژهەڵاتن.

٢-کاتێ ڕۆژ لەناوەڕاستی ئاسمان دایە تا لار دەبێتەوە.

٣-دوای نوێژی عەسر تا ڕۆژ ئاوابوون.

# کتابی رۆژوو (الصیام)

**رۆژوو:** بریتیە لەخۆگرتنەوە لەوشتانەی کەرۆژوو دەشکێنن لەبانگی بەیانیەوە تا رۆژئاوابوون لەگەڵ هەبوونی نیەت.

**حوکمەکەی:** رۆژوی مانگی رەمەزان واجیبە لەسەر موسڵمانان چونکە پایەکە لەپایەکانی ئیسلام.

## مەرجەکانی رۆژوو:

١-ئیسلامەتی.

٢-ژیری.

٣-نیەت بوون.

٤-بەرۆژوبونی هەموو رۆژەکە.

٥- بالغ بوون

## سونەتەکانی رۆژوو ئادابەکانی:

١-پاشیوکردنو دواخستنی.

٢-زوو بەربانگ کردنەوە (سونەتە بە روتابی تەر ئەگەر نا بەخورماو قەسب ئەگەر نا بە ئاو) فتار بکاتەوە.

٣-وازهێنان لەکردارو رەفتاری خراپ (درۆ، غەیبەت، نەزەر، دەمەقاڵی...).

٤-خۆشوشتنی لەش گران پێش نوێژی بەیانی.

٥-قورئان خوێندن، ماڵ بەخشین، دوعا کردن لەکاتی ڕۆژوشکاندن.

## ئەوەی بۆ ڕۆژووەوان دروستەو بەتاڵی ناکاتەوە:

١-خۆشوشتن‌و فێنك کردنەوە.

٢-ئاو لەدەم‌و لوت وەردان بەبێ زیادەڕەوی.

٣-کەلەشاخ کردن‌و خوێن بەخشین.

٤-ماچ کردنی خێزان و دەست گەمە کردن بۆ کەسێك کە خۆ گربێ.

٥-توش بون بەجەنابەت.

٦-چاوڕەش کردن‌و خۆبۆن خۆش کردن‌و قەترە کردنە گوێ‌و چاو.

٧-لێدانی دەرزی بە مەرجێك وزە بەخش (مُقوی) و خۆراك بەخش (مغذي) نەبێت.

٨-سیواك کردن.

٩-خواردن و خواردنەوە ئەگەر لەبیری نەبوو.

١٠-قوت دانی تف بە هەموو جۆرەکانی.

## ئەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن:

١-خواردن یان خواردنەوە.

٢-جیماع کردن یان ئاو هاتنە خوارەوە بە هۆی دەست بازی کردن.

٣–حەیزو زەیسانی.

٤–رشانەوە بە ئەنقەست.

## رۆژووە سونەتەکان

١–رۆژی عەرەفە.

٢–نۆ رۆژی سەرەتای مانگی ذي الحجة.

٣–مانگی موحەڕەم بەتایبەتی (٩، ١٠).

٤–(١٣، ١٤، ١٥)ی هەموو مانگێکی کۆچی.

٥–شەشەلان.

٦–رۆژوی مانگی شەعبان.

٧–رۆژوی دووشەممە و پێنج شەممە.

٨–رۆژێك نا رۆژێك.

## ئەو رۆژانەی کە رۆژوگرتنیان تێدا حەرامە:

١–رۆژوی دوو جەژنەکەو سێ رۆژی دوای جەژنی قوربان.

٢–رۆژی هەینی بە تەنها یان رۆژی شەممە بەتەنها.

٣–رۆژی گومان (یوم الشك).

٤–گرتنی رۆژووی هەموو رۆژەکانی ساڵ.

٥–ئافرەت بەبێ رەزامەندی مێردی بۆی نیە رۆژوی سونەت بگرێت.

هەر کەسێك بە بیانوی شەرعی (حەیز، موسافر، ...) ڕۆژوی شکاندبێ دەبێ بیگێڕێتەوە.

کەسێك بمرێت ڕۆژی لەسەر مابێت کەس و کاری بۆی دەگێڕنەوە.

پیرو پەکەوتەو نەخۆشی درێژخایەن توانای گرتنی نەبێت ڕۆژوو ناگرنەوە تەنها خواردنی هەژارێك دەدەن لەبری هەر ڕۆژێك.

ئافرەتی سك پڕو شیردەر زانایان تێیدا رایان جیاوازن بەلام هەندێکیان لەسەر ئەو رایەن کە نایگرنەوە بۆ هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدەن.

وصلى الله وسلم على محمد وآله أجمعين

## سەرچاوە

١-صحيح فقه السنه/ أبو مالك كمال  بن سيد سالم

٢-الادله الرضية/ محمد على الشوكانى

٣-رێبازی پەیڕەوكاران/عبدالرحمن ناصر السعدى

٤-پوختەی فیقهی شەریعەت/طارق حسن الهموندى

٥-پوختەی شەریعەتی ئیسلام/ملامحمد ملا صالح بامۆكی

## ناوەرۆک